وەهبی وەققاس ئۆغلۆو

5

سێیەم چاپ

# یاداشتنامەی مامۆستایەک





و: د.زانا ئەحمەد



بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: یاداشتنامەی مامۆستایەك

بەرگی پێنجەم

نووسەر: وەهبی وەققاس ئۆغڵوو

وەرگێڕ: د. زانا ئەحمەد

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٦٣٧)ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە

# پێشەکی

لە کاتی نووسینی هەر پێشکۆتنێکدا، بیری ئەوەی کە ڕەنگە ئەمە دوا گۆتن بێت، دڵم دادەخورپێنێت.

چونکە پێکەوە بوون لەگەڵ ئێوە، گەیشتن پێتان لە دێڕو لاپەڕەکاندا گەلێك خۆشە.

بەیەك گەیشتن لەسەر بنچینەی باوەڕ و خۆشەویستیی و ئاکارە جوانەکان، خۆشترین و پڕماناترین لایەنی ژیانمانە...

بەڵام غەم خواردنی بۆ چییە؟!... مەگەر لە بەهەشتیشدا، یەکێك لە خۆشترین نیعمەتەکان، گەیشتن بە دۆستان و قسە کردن نییە لەگەڵیان؟ ئینجا بە دوور بوون لە گشت جۆرە غەم و پەژارەیەك و ئەوپەڕی تێری لە چێژە بێ ئازار و خۆشییە سازگارەکانەوە... تەنانەت بیرکردنەوەش لە وەها پێکەوە دانیشتنێك، چەند خۆشە!...

ئەم ئومێدە -کە باوەڕەکەمان پێمانی دەبەخشێت- نەبووایە، ژیانمان چەند بێ مانا و پڕوپووچ دەبوو؟!

لەم ژینی دونیایەدا چی هەوڵ و کۆششمان هەیە، بۆ ئەوەیە بتوانین بلیتی ڕۆژی دوایی بۆ بەهەشت ببڕین... چی بکەین، هەر چییەك بکەین، ناتوانین مردن بمرێنین. بۆیە ناچار هەر دەبێ ملی ڕێی ڕۆژی دوایی بگرینەبەر. کە وا بوو هەق وایە «جوان ژیان، جوان

مـردن، و زیندووبوونـەوە بـە جوانییـە ئەبەدییەکانـەوە» ئامـانجی نەگۆڕمان بێت...

پێکەوە چوون بەرەو ئەو ئامانجە... بینینی گشت مرۆڤایـەتی بـە کامەرانی لەم دونیا و لەو دونیا... بەڵێ، هـەر بەڕاسـتی سیفەتەکانی مرۆڤێتیی، ئەمانە پێویست دەکەن.

نابێت ئەو پەیوەندییەی نێوان مرۆڤەکان کە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پتر ڕەقی و بێ بەزەییانەتر دەچن کار لـە ئێمـە بکـەن. نابێـت هـەرگیزا و هەرگیز ئەوە لەبیربکـەین کـە تاکـە ئـەرکی سـەر شـانمان ئەوەیـە لـە تاریکاییەکاندا مۆم دابگیرسـێنین و تـۆوی خۆشەویسـتی بخەینـە دڵـە ڕەق داگەڕاوەکانەوە.

سەرجەمی ئەو ڕۆحە مەزنانەی لە ئامانجی بەدیهێنران لایان نـەدا، هەر خـەریکی هـەوڵ و کۆشـش بـوون لـەم پێنـاوەدا. وەك بلێـی دڵـی گەورەیان لەت کرد و لە گەنجینەی خۆشەویسـتییان، بـێ لەبـەر چـاو گرتنی هەر جیاکارییەك بەشی تێکڕای مرۆڤ و ئـاژەڵ و ڕووەکـەکانیان دا و هیچیان لێنەهێشتەوە.

ئەو خودا گەورەیەی ئێمەی بە خۆشەویستییەوە لە خۆشەویستیی خۆی بەدیهێناوە، فەرمانی بـە خۆشەویسـتیی داوە و قـین و خـوێن و دوژمنداریی قەدەغە کردووە. گشـت دونیـای بـوونیش –بـە گیانـدار و بێگیانەوە– وەك جێ دەسـتێکی ئـەو کردگـارە بـە خۆشەویسـتییەوە دەبن بە تەواوکەری یەکدی و پاڵپشتی لە یەکدی دەکەن.

بـــەم شـــێوەیە، لـــە گەردوونـــدا پێکـــەوە ســـازان و تـــەبایی و ڕێکوپێکییەکی سەیر هاتووەتە ئاراوە.

ئـەو مرۆڤانـەی دەسـتیان لـە خۆشەویسـتیی بـەرداوە، بـێ وچـان خـــەریکی تێکـــدانی ئـــەم ڕێکوپێکییـــەن. خەریکـــە لـــە پێنـــاوی خۆپەرستیدا، وا لە دونیا بکەن، جێی ژیان نەبێت.

بـێ ئـەوەی پەنـد لـەو خاکـە بەخشـندەیەی بـەردەوام خـەریکی بەخشینە و ئەو خۆرەی بەردەوام بەخۆشییەوە پرشنگی دەداتـەوە و ئەو ئاوە خاوێنەی گیان دەکات بە بـەر گیانـمـان، کەسـانێك خـەریکی بڵاوکردنەوەی سلبییات و قرچۆکی و بەرژەوەندی پەرستین...

دەبێ ببین بە دەنگێـك بتوانێـت بـە گشـت ئـەم نارێکییانـە بڵێـت: «بوەستە!». دەبێ وەك موگناتیسێك برا مرۆڤەکانمان بەرەو چاکە و ڕاستی و جوانی کێش بکەین.

«یاداشتنامەی مامۆستایەك» گەرەکییەتی بەمە هەڵبسێ. دەیەوێ بە بەدەمەوە هاتنی ئێوەش ببێ بـە داوەتنامەیـەك کاریگـەریی زیـاتر ببێ.

داوەتنامەکەمان بۆ بوون بـە مرۆڤـی کامـڵ و پـەرەپێـدان و جـوان کردنی پەیوەندییە مرۆییەکانمان و... کورتییەکەی کامەرانییە.

چونکە مرۆڤایەتی بەتێکرا شایانی ئەوەیە کامەران ببێ.

هـەق وایـە هـەر هـەمووـمان ڕۆڵمـان هـەبێت لـە کامـەرانیی هـەموو کەسێکدا.

لەبەر ئەوەی لە بەرانبەر داوەتنامەکەماندا وتووتانە: «بەڵێ»، ڕێز و خۆشەویستی پێشکەشی یەکە بە یەکەتان دەکەم.

وەهبی وەققاس ئۆغڵوو
١٩٩٦/١/١
باخچەلی ئێڤلەر





# ئەو منداڵەی گوڵەباخی هێنا

**گوڵێك كە سیمبولی پێغەمبەرە..**

داوام لە هەمووان كردبوو ئەو ڕۆژە هەر یەكەو گوڵێك بێنن. لەو بەیانییە خۆشەی ئیستەنبوڵدا، كە خەریك بوو بەهار جێی بۆ هاوین چۆڵ دەكرد، پۆلەكەمان بووبوو بە باخچەیەكی ڕەنگین. چونكە زۆر لە قوتابییەكان، لەو گوڵانەی هەڵیان بژاردبوو، دانەیەك نا، بەڵكو چەپكێكیان هاوردبوو. بڕیار بوو لەو ڕۆژە خۆشەدا، لە بەینی ئەو جوانییە شاهانانەدا هەڵبژاردنێك بكەین و جوانترینیان دیاری بكەین.

ڕەحلەکانی پێشی پێشەوەمان چۆڵ کرد و چەپکە گوڵەکانمان بەپاڵ یەکەوە ڕیز کرد و ژمارەمان بۆ دانان. دەبوو هەر قوتابییەك باسی تایبەتمەندی و جوانییەکانی ئەو گوڵە بکات کە هێناویەتی و هەوڵ بدات بە یەکەم دەرچوونی مسۆگەر بکات...

بەرنامەکەمان دەستی پێکرد. لە قەرەنفیل و لێلاق و هەڵاڵەبرمەوە تا دەگاتە گوڵەباخ، کە نزیکەی سی جۆرە گوڵ دەبوون، بەکورتی ناسێنران. ئینجا هاتینە سەر دەنگدان. گوڵەباخە قەدیفەییە سوورە ڕەش باوەکە، کە بۆنێکی دڵڕفێنی هەبوو، بە جیاوازییەکی زۆرەوە لەسەر تەختی یەکەمیی دانیشت. خەدیجە -کە ئەو گوڵەباخانەی هێنابوو- لەنێو خۆشی و کامەرانییەکدا کە شایانی بوو، سوپاسی هاوڕێکانی کرد. پرسیاری ئەوەی لە من کرد -کە بێلایەن مابوومەوە و دەنگم نەدابوو- داخۆ ئەنجامەکەم پێ چۆنە. وتم:

- منیش دەنگم بدایە، هەر گوڵەباخم هەڵدەبژارد...

هەڵبەت دەمودەست هۆکەیان لێپرسیم. پێم وتن:

- گوڵەباخ لە ئەدەبیاتماندا بە سیمبولی پێغەمبەرمان (درودی خودای لێ بێت) دانراوە و بە «گوڵی موحەممەدی» ناوبراوە. جگە لەوە، باس لەوەش دەکرێ کە ئارەقەی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) بۆنی وەك بۆنی گوڵەباخ بووە. ڕەنگە هەر لەبەر ئەوە بێت، کە ناوی گوڵەباخ لە هەموو گوڵانی تر زیاتر لە مرۆڤ نراوە. بۆیە

هەڵبژاردنەکەتانم بەدڵ بوو. وەلێ ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە گوڵەکانی تر ناشیرین و دزێون. هەریەکەیان جوانیی و تایبەتمەندیی تایبەت بەخۆی هەیە. ئینجا خۆ گوڵەباخیش دڕکی هەیە. هەر بۆیە باب و باپیرانمان وتوویانە: "ئەوەی گوڵەباخی خۆش بوێ، دەبێ بەرگەی دڕکەکەشی بگرێ". ئەمەش ئەوە دەردەخات، کە لە کاملترین جوانییەکانی دونیاشدا کەموکوڕی هەیە. جوانیی تەواو کامڵ و بێکەموکوڕی، تەنها لە بەهەشتدا هەیە. دونیا وەك جامخانەیەکی نمایشی بەهەشت، هەندێك نموونە نمایش دەکات و وەك بڵێی پێمان دەڵێت:

– ئەوانەی دونیا ئەوەندە جوان بن، دەبێ جوانییەکانی ڕۆژی دوایی چەند جوان بن؟! بۆ خۆتان بەراوردی بکەن و هەوڵ بدەن ئەو جوانییە ڕاستەقینەیە دەست خۆتان بخەن.

دڕکەکانی گوڵەباخیش وانەیەکمان فێر دەکەن. ئەویش وانەی گەشبینییە... نابێ کە لە گوڵەباخ دەڕوانین گلەیی ئەوە بکەین بە دڕکاویی بەدیهێنراوە. بەپێچەوانەوە، دەبێ شوکرانەی خودا بکەین لە بەرانبەر ئەوەی لەنێو ئەو دڕکانەدا جوانییەکی وای بەدیهێناوە. ژیان هەردەم ئەوەندەی گوڵەباخ جوان نییە. هەندێك جار و بگرە زۆرێك جار وەك دڕك ڕەق و بەئازارە. دەبێ وەك ئەوەی هەیە قبووڵی بکەین و لە بەرانبەر دڕکەکاندا وریا بین و ڕێوشوێنی پێویست بگرینەبەر.

ئەوەش لەبیر نەکەین ئەرکی ئێمە ئەوەیە سەیری گوڵەکان بکەین و گەشبین بین، نەك سەیری دڕکەکان بکەین و ڕەشبین ببین.

لەم نێوەندەدا، ڕەجەب کە بەردەوام داوای دەکرد مۆڵەتی قسەکردنی پێ بدەم، سەرنجی ڕاکێشام.

پێم وت:

– بڵێ بزانم.

– مامۆستا! دەڵێم ئەگەر خەڵاتێکی تایبەتیش ببەخشین... ئەوە نییە هەندێ جار لە پێشبڕکێکاندا خەڵاتی تایبەتی لیژنەی هەڵسەنگاندن پێشکەش دەکرێت، ئا وەك ئەوە...



– جا خەڵاتێکی تر بۆ بدەین؟

– ئەو گوڵەی عەدنانی هاوڕێمان هێناویەتی، لە چڵەکەی لێنەکراوەتەوە. ئەو نەچووە وەك هاوڕێیانی تر لێیان بکاتەوە، بەڵکو بە گوڵدانەکەیەوە هێناویەتی. من ئەم هەڵسوکەوتەیم زۆر چووەتە دڵەوە. هەڵسوکەوتێکی زۆر ناسك و هەست بزوێنە. ئەمە سەرباری ئەوەی گوڵەکانیشی زۆر جوانن.

پێشنیازەکەی ڕەجەبم خستە دەنگدانەوە. بە زۆرینەی دەنگ پەسەند کرا. عەدنان سوپاسی گشت هاوڕێکانی و بەتایبەت ڕەجەبی

کرد. منیش لە بەرانبەر ئەو هەڵسوکەوتە جوانەیاندا، دەستخۆشیم لە هەردووکیان کرد. بۆ هەر یەك لە خەدیجە و عەدنان، سەرو کتێبێکی خۆمم بە ئیمزای خۆمەوە بۆ کردنە دیاری. خەدیجەش گوڵەباخەکانی پێشکەش کردم. گوڵەکانی تریشمان خستە نێو گوڵدانی پۆلەکەمانەوە. عەدنانیش ویستی گوڵەکانی خۆی پێشکەشی من بکات. بەڵام قبووڵم نەکرد و داوام لێکرد وەك یادگارییەکی ئەم ڕۆژە بیباتەوە ماڵی خۆیان. خەدیجە کە گوڵەباخە جوانەکانی پێشکەشکردم، وتی:

"ئەم گوڵەباخە جوانانەی کە لای هەموومان خۆشەویستن، دەکەم بە دیاری بۆ گوڵەباخی پۆلەکەمان - کە مامۆستاکەمانە".

زۆر هەستم بزوا، سوپاسم کرد و وتم:

- ڕاستییەکەی ئەوە ئێوەن گوڵەباخانی منن. ئەو گوڵەباخە بێنموونانەی کە هێشتا خونچەن، ئێوەن. گشت گوڵ و گوڵەباخ و شتێك بە ئێوەوە جوان و ماناداره... ئێ خۆ خودای گەورەش کە ئەمانە و گشت جوانییەکانی دیکەی بەدیهێناون، بۆ ئێوە واتە بۆ گرۆی مرۆڤایەتی بەدیهێناون، چونکە تاکە گیانەوەرێك کە لە جوانییەکان دەگات و دەتوانێ بەدیهێنەرەکەی بناسێت، مرۆڤە. هەموو جوانییەکانی سەر ڕووی زەوی جێدەست و بەخششی ئەو جوانی جوانانەن. ئەو سەرچاوەی جوانییەکانە. گشت جوانییەك هەواڵدەری جوانیی بێ کۆتای ئەوە. بە سەیرکردنی ئەو جوانییانە کە

جێدەستی ئەون، لە زانست و توانای بێ سنوور و خەللاقیی بێکۆتای ئەو خالقە دەگەین. هەر لەم گۆشەنیگایەوەیە باب و باپیرانمان وتوویانە: **"لە جوان ڕوانین خێرە"**. جوانیی جێدەستەکانی بەرەو جوانیی خۆیمان دەبات. دەبێ بڕوانین و ڕابمێنین. پێغەمبەرمان (درودی خودای لێبێت) باسی لەوە کردووە کە بیرکردنەوەیەکی وا، لە کردنی چەندین ساڵ پەرستشی نافیلە (سوننەت)، خێری زیاترە. ئەوسا وامان لێدێ جوانییەکانمان —لەبەر ئەوەی جێدەستی ئەون— خۆش بوێت. بەم جۆرە ئەو جوانییانەی بە لێ ڕوانینیان کەیف خۆش دەبین، دەبنە هۆی ئەوەی خێری پەرستش بەدەست بێنین.

هەر شتێك کە لەم دونیایەدا دەیبینین، پیت و وشە و ڕستەی نامەیەکە کە ئەو بۆی نووسیوین. ئەگەر بزانین ئەو نووسینە بخوێنینەوە، ئەوە لە دەرخستنی خۆی زیاتر، کردگاریی خۆیمان پێنیشان دەدات. وەك چۆن هەر پیت و وشە و ڕستەیەك بۆ ئەوانەی دەزانن بیخوێننەوە گوزارشت لە مانایەك دەکات، ئاواش سەرلەبەری جوانییەکانی سروشت، هەر لە دەریا و تاوێر و ڕووەك و درەخت و ئاژەڵ و مرۆڤ و چی لە ئاسمان و زەویدا هەیە، هەر خەریکی پیشاندانی جێدەستی خودای گەورەن. ئاوە جوان و سیفەتە مەزنەکانی ئەومان پێدەخوێننەوە. هەر بۆیە ئەوانەی بە چاوێکی باوەڕدارانەوە لەم دونیایە دەڕوانن، بوونەوەرەکان تەنها وەك نەخش

و نیگـار و جوانییـەك نـا، بـەڵكو هـاودەم وەك دێـڕ و لاپەڕەگـەلێکی پڕمانا دەبینن و دەیخوێننەوە و لێی تێدەگەن...

با ئێستا من دەمەتەقێیەك لەگەڵ ئەم گوڵەباخە بکەم کە خەدیجە کردویەتی بەدیاری بۆم. با بزانین چیم پێدەڵێن؟ یان بـا هـەوڵ بـدەم بیانخوێنمـەوە. تـۆ بڵێـی ئـەو مانایانـەی هـەڵیان گرتـووە، بەتـەواوی بیاندۆزمەوە.

"ئـەی گوڵـەباخ! ئـەو جوانییـە ئەفسـووناوییەت چـۆن بەدەسـت هێنـاوە؟ ئایـا ئـەو قـەدە باریکەلانـە و ڕەگەکـەی نێـو گڵـت، ئـەم جوانییـەیان بـۆ دەسـتەبەر کردوویـت؟". ئـەها گـوێ ڕادێـرن، چـۆن دەڵـێ: "نـەخێر. ئـەی مرۆڤـی ژیـر! ئـەم ڕەگ و قەدانـەم کـە هـەر دەتـوانرێ بـە نیوەزینـدوو دابنـرێن، لـە کـوێ دەزانـن گـوڵ دروسـت بکـەن؟!... ئـەم ڕەنگـە جوانانـە کـەی لـە توانـای ئەواندایـە؟! ئـەو لێکهاتنەی هەردوو ڕەنگی سەوز و سـوور، ئـەو بۆنـە خۆشـەی شـادی دەبەخشێتە لووتتـان، چـۆن لـەنێو خـاکێکی بۆگیـان پێیـان دروسـت دەکرێت؟! ئەو گەڵایانەم کە ئـاوا چـوون بەیەکدا، ئـەو دڕکانـەم کـە چـەکی دەسـتمن لـە بەرانبـەر دەسـتە شـەڕانگێزەکان، هـیچ یـەکێك لەمانە، مـن بـیرم لێنەکردوونەتـەوە. ئـەو گڵـەی بەخێویشـم دەکـات، سەری لە گوڵ دروست کردن دەرناچێ. ئەو مرۆڤەی خۆیشـی دەکـات بە خاوەنم، لە زانست و توانستی گوڵ دروست کردن مەحروومە. هـەر بۆیـە، گـەر بتـەوێ ئـەو کەسـە بدۆزیتـەوە کـە هێناومییەتـە بـوون،

ناچاریت بەدوای کردگارێکدا بگەڕێیت کە زۆر لەسەروو مرۆڤ و گەردوونەوەیە و بالاترە...".

***

کە زەنگ لێدرا، زۆرێك لە قوتابییەکان کەوتبوونە قسەکردن لەگەڵ گوڵەکان و پرسیار کردن و وەڵام وەرگرتنەوە لێیان... منیش چوومە ناویانەوە و درێژەم بە قسە و باسەکەمان دا.

– گوڵەکانم!... ئەگەر بەو چاوە، واتە بە چاوی ئەقڵەوە بڕوانن و هەوڵی تێگەیشتن بدەن، ئێوەش دەتوانن وەك ئەوەی شاعیر دەڵێت، بڵێن: "جاڵجاڵۆکەیەك بەرەو خودای گەورەم دەبات". چونکە سەیری هەر جێدەستێکی بکەن لە بچووکترینەوە تا گەورەترین هەر هەموویان بەرەو ئەو –ئەو زاتەی کە هێز و توانا و بەدیهێنەریی بێکۆتایە– واتە خودای



مەزنتان دەبەن. لەم سۆنگەیەوەیە وتراوە: "ئەو ڕێیانەی مرۆڤ بەرەو خودای گەورە دەبەن، بەقەد ژمارەی هەناسەی مەخلووقات زۆر و زەبەندن".

***

هەفتەیەك دوای ئەم وانەیەمان بوو. قوتابییەکم کە لە هەمان پۆل بوو و تا بلێی هێمن و بێدەنگ بوو، هاتە لام. سەتڵێکی گەورەی پڕ لەو گوڵەباخانەی لەدەست بوو کە زۆرم حەز لێبوون. لە بەرانبەر ئەو جوانییە سەراسیمەیەی چێژیان دەبەخشییە چاو و لووت، سوپاسم کرد. هۆشداریی ئەوەشم دایێ جارێکی دیکە نەچێتە ژێر باری ئەو زەحمەتییە کە زۆر گرانبەها ڕادەوەستا. بەڵام ئەو چەپکە جوانە لەوە نەدەچوو لە گوڵفرۆش کڕابێت. لێم پرسی داخۆ لە کوێی کڕیوە. کەمێك سڵی کردەوە، هەڵوەستەی کرد، کەوتە ڕامان، تا ئەوەی وتی: "لە دراوسێکەمان"...

وتم:

– دەستخۆشی لەو دراوسێیەتان دەکەم کە گوڵی ئاوا جوان بەخێو دەکات. سەلامی منی پێبگەیەنە و ئەوەشی پێبڵێ کە دەستخۆشیی لێدەکەم. پێشی بڵێ ئەگەر قایل بێت، حەز دەکەم لەگەڵ ئەو مرۆڤە جوانەی خووی داوەتە ئەو کارە جوانە تەعاروف بکەم...

بەڵام ئەوە چی بوو؟! کە من ئەو قسانەم کرد، ڕوخساری (ئۆکتای) شێوا و هەستم کرد کەمێك حاڵی تێکچوو....

گوڵەکانم خستە گوڵدانەکەی پۆلەوە.

– حەز دەکەم هەم تەعاروفێك لەگەڵ ئەو کەسە بەزەوقە بکەم کە ئەم گوڵانەی بەخێوکردووە، هەمیش ئەگەر بکرێت هەندێك تۆوی ئەم

جۆرە گوڵەی لێوەربگرم، دەمەوێت منیش لەمانە بڕوێنم و بەخێویان بکەم...

ئۆکتـای یەکسـەر لـێم دوور کەوتـەوە پەلـەی بـوو بچـێتەوە شـوێنەکەی خـۆی و چـەندی دەکـرد نەیـدەتوانی لـە دڵـەوە بڵـێ: "باشە"... لەدوای تەواوبوونی وانەکـە بـانگم کـردە لای خـۆم. لەبـەر هەست ناسکییەکەی دووبارە سوپاسـیم کـردەوە و لـێم پرسـی داخـۆ کەی دەتوانێ بمباتە لای دراوسێ گوڵ بەخێوکەرەکەیان؟

ئەی ئای، ئەوە چییە؟! ئەسرینەکانی ئۆکتای کەوتنە دابـارین بـۆ سەر گۆنا سوور هەڵگەڕاوەکانی.

ئەوەی ڕاستی بێت، کەمێك سەرم سوڕما. وتم:

– دەبێ پێم بڵێی بۆ بە قسەکانم دڵتەنگ بوویت. ئەگەر نا، نە من و نە تۆش ناچینە دەرسەوە...

ئۆکتـای دوای سـڵەمینەوە و نکوولییـەکی زۆر، هـەوڵی دا هەنسکەکانی ڕابگرێت و وتی:



– مامۆستا! من ئـەو گوڵانـەم بـەبێ ئاگـاداری هاوسـێکەمان، لـە باخچەکەیان هێنا.

ئەم وەڵامە نەرێنییـە، تووشـی سەرسوڕمانێکی زۆری کـردم. لـێم پرسی بۆ ئەو هەڵەیەی کردووە.

وتی:

– مامۆستا! من تۆم زۆر خۆش دەوێت. کە زانیم زۆر حەزت لە گوڵەباخە، ویستم موفاجەئەیەکت بۆ دروست بکەم و دڵت خۆش بکەم.

– ئۆکتای! ئەوەی کە من حەزم لە گوڵەباخە ڕاستە. بەڵام گوڵەباخ بۆ من هێمایە بۆ حەزرەتی موحەممەد (درودی خودای لێبێت)... کەچی تۆ هەڵساویت ئەو گوڵەی بووە بە هێمایەك بۆ ئەو پێغەمبەرە نازدارە (درودی خودای لێبێت)، بێئاگاداری و مۆڵەتی خاوەنەکەی لێت کردوونەتەوە و هێناوتن، بەمەش پێشێلی فەرمانێکی زۆر گرنگی حەزرەتی موحەممەد (درودی خودای لێبێت)ـت کردووە. واتە مافی بەندەیەکی خودات خواردووە، ناهەقیت کردووە. ئەم کارەی کردووتە بەپێی ئاینەکەی ئێمە حەرامە. دەزانی حەرام یانی چی؟

– بەڵێ، مامۆستا! ئەو شتانەی خودای گەورە بە شێوەیەکی بنبڕ قەدەغەی کردوون، پێیان دەوترێت حەرام. تۆ ناتەوێ بیلێیت، بەڵام ئەو کارەی من کردوومە، بێ سێ و دوو دزییە.

– مادام وایە، ئێستا چی دەکەین؟ چۆن ئەم بارە ڕاست دەکەینەوە؟

خەمە تەواو زیادبووەکەی ئۆکتای منیشی خەمبار کرد. تەکلیفێکم لێکرد:

– دەبیٚ ڕێیەك بگریتە بەر کە ئەم کارە خاوێن بکاتەوە و بگرە لە گوناهەوە بیکاتە خێر و چاکە. واتــە دەبێـت بچیتە لای ئـەو دراوسـێ خاوەن باخچەیەتان و پێی بڵێیت:

"مامە! من بەبێ ئاگاداریی تۆ، دوانـزە گوڵـەباخم لـە باخچـەکەت کردەوە و بردمن بۆ مامۆسـتاکەم. چـونکە ئـەو بـە نـاوی ئـەوەی کـە گوڵــەباخ ســیمبولی پێغەمبەرمانــە (درووودی خــوای لەســەر بێــت)، گوڵەباخی زۆر خۆش دەوێت. ئامانجی من تەنها ئەوە بوو ئەو دڵخۆش بکـەم. بـەڵام پارەشـم نـەبوو لای گوڵفرۆشـێك بیـانکڕم. بۆیـە ئێسـتا هاتووم دەمەوێ پارەی ئەو گوڵانەت بۆ ببژێرم و گەردنی خۆمـت پـێ ئازاد بکەم".

بەڵێ، ئۆکتای! تاکە ڕێگەی ڕزگار بوون لە دەرهاوێشـتەکانی ئـەم کارە نەشیاوە، ئەوەیە گەردنی خۆت بـە هاوسـێکەتان ئـازاد بکـەیت. من پـارەت دەدەمـێ و تـۆش دەبێـت ئـەو بوێرییـە پیشـان بـدەیت و چارەی ئەم کارە بکەیت...

ئۆکتای بەم قسانەم تا بڵێی شێوا...

– بەڵام مامۆستا! دراوسێکەمان گوڵەکانیی زۆر خۆش دەوێـت... جگە لـەوەش کابرایـەکی تـووڕە و تونـدە. پارەکەشـی بـدەمێ، هـەر بـاوەڕ ناکـەم لـێم خـۆش بـبێ و گـەردنم ئـازاد بکـات. تەنانـەت هـیچ دووریش نییە بکەوێتە لێدانم...

- ئۆکتای بوێریە. گوێی مەدەرێ، با لێدانیشی تێدا بێت، تۆ هەر بڕۆ لای ئەو زاتە. گەشبینم بەوەی لە پەشیمان بوونەوەکەت دەگات و پێشوازیت لێدەکات. منیش دوعات بۆ دەکەم. ئینجا ئەو سزا و سووکایەتییانەی بۆی هەیە لەسەر ئەم کارە ڕووبەڕوویان ببیتەوە، پێم وایە زۆر لە سزاکانی ئەم کارە لە ڕۆژی دوایی کەمتر و ساناترن... ئێستا دەمەوێ بتخەمە ناو یەکەمین تاقیکردنەوەی مەعنەویی لە ژیانتدا. دەی بزانم، دلێر و بوێریە...

لەسەر ئەم قسانەی من، ئۆکتای هەندێك بە نابەدڵییەوە قایل بوو و وتی:

- مامۆستا گیان! هەوڵ دەدەم ئەوەی دەیانڵێی جێبەجێیان بکەم.

***

هەفتەیەکی بەسەردا تێپەڕی. دیسانەوە لە پۆلەکەی ئۆکتای و ئەوان بووم. ناوی ئامادەبووانم وەرگرت. تەنها ئۆکتای نەهاتبوو. خەریك بووم لە هاوڕێکانیم دەپرسی بۆ نەهاتووە، ئەو لەپڕ لە دەرگاوە دەرکەوت. بەڵام چی ببینم، چەپکێ گوڵەباخی زۆر جوان و سەرنج ڕاکێشتر لەوانەی هەفتەی ڕابردووی، بەدەستەوە بوو.

بەدەست خۆم نەبوو، ڕاچڵەکیم و بە چاوی پڕ لە پرسیارەوە لە ئۆکتایم نواڕی. بەڵام ئەم جارەیان هیچ ترس و سڵ کردنەوەیەك لێی دیاری نەدەدا. بەڵکو بەپێچەوانەوە، چاوەکانی بزەیان دەهات.

– مامۆستا گیان! هەوڵم دا ئەوەی تۆ وتت، بەتەواوی جێبەجێی بکەم. ڕۆیشتم بۆ لای مامە گوڵفرۆشەکە و داوای لێبووردنم لێکرد. ئەویش پرسیی بۆ ئەو داوای لێبوردنەی لێدەکەم. منیش گفتوگۆکەی نێوان خۆم و خۆتم بۆ گێڕایەوە. ئەوەم بۆ ڕوون کردەوە کە دەمەوێ لەو گوناهە ڕزگارم ببێت. لەسەر ئەمە زوێر بوونەکەی وەرچەرخایە سەر دڵخۆشیی و، دەستخۆشیی لێکردم. وتی تا ئێستا زۆر کەس لە باخچەکەمان گوڵی دزیوە، ئەوە تۆ یەکەم کەسیت داوای لێبووردن و گەردن ئازادیم لێدەکەیت. ئافەرین بۆ تۆ. ئەو پارەیەی هێناوتە وەری دەگرم و دووبارە دەیدەمەوە پێت. وەك دیارییەکی مـن قبـووڵی بکە... ئینجا ئەو مامۆستایەشت کە ئەم باوەڕە جوانەی فێـر کردوویت ڕێـز و سـڵاوی پـێ بگەیەنـە و جـوانترین گوڵـەباخی باخچەکەمی بۆ ببە. لە کانگای دڵەوە دەستخۆشیی لەویش دەکەم. هەر کاتێك ویستت دەتوانیت بێیت و داوای گوڵم لێبکەیت. ئەگەر قبووڵیشی بکەیت لەمڕۆوە ببە بە کوڕی مەعنەویی من. تا ئێستا زۆرم ئاوات خواستووە ببمە خاوەنی کوڕێك، بەڵام تا ئێستا نسیبم نەبووە. ئێستا بەقەد کوڕی خۆم خۆشم دەوێیت. ئایا ڕازییت؟

منیش لە ئاست ئەو تەکلیفەی ئەو مامە پیرەیەدا وتم: "بـەڵێ"... مامۆستا گیان! لە سایەی جەنابتـدا بـووم بـە خـاوەن دۆستێکی زۆر سەنگین. خودا لێتان ڕازی ببێت...

سوپاسی ئۆکتایم کرد و پێم وت:

– ئافـەرین، ئەركەكـەتت زۆر بـاش بـەجیٚ گەیانـدووە. دەرگایـەك نییە چاكی و ڕاستی نەتوانن بیكەنەوە. خودا هـەردەم یارمەتیـدەری ڕاستییەكانە. ئیٚستا منیش بەهۆی تۆوە بووم بە خاوەنی دۆستیٚك كە هـۆگری گوڵەباخـە. بڵـیٚ بـزانم، كـەی لەگـەڵ باوكـە مەعنەوییەكەتـدا تەعاروفم پیٚدەكەیت؟

چەند ڕۆژیٚك دواتـر كـە بـۆ لای مامـەی گـوڵفرۆش دەچـووم، بـیرم دەكردەوە: ئایا ئەو خۆشییەی تیٚیداین، لـە ئـەنجامی خۆشەویسـتیی پیٚغەمبەر (درووودی خودای لیٚبیٚت) و ئـەو گوڵـەوە نییـە كـە سـیمبولی ئەو خۆشەویستەیە. بەڵیٚ بە خۆش ویستنی ئەو، هەمیشە دۆستایەتی و تەبایی و مرۆڤایەتیی ڕاستەقینە پەرە دەسـیٚنیٚت و گەشـە دەكـات. شاعیر چەند جوانی وتووە:

لـــە مـەحـەبـبـەت، مـوحـەمـمـەد بـوو حاسڵ

بیٚ موحـەممەد، مەحـەببەت چۆن دەبیٚ حاسڵ؟

لە خۆشەویستیی بیٚكۆتای خودای گەورەوە، موحەممەد (درووودی خودای لیٚبیٚـت) پەیـدا بـوو. ئـەو موحەممـەدەی كـە بـە ژیـانی خـۆی پیشانی داین، بوون بە مەخلووقی بـاڵا و نموونـەی مرۆڤایـەتیی چـۆن چۆنی دەبیٚت. سەرجەم ئەو ئاكـارە جوانانـەی خـودا داوایـان دەكـات ئەو لە ژیانی خۆیدا بەرجەستەی كـردن و شـكۆی بـە دونیـا بەخشـی. خۆشەویستییەك، خۆشەویستیی حەزرەت (درووودی خـودای لیٚبیٚـت)ی

له ناخدا هه‌ڵنه‌گرتبێت، چیی لێ به‌رهه‌م دێ؟! به‌ڵێ، بۆ ئه‌وه‌ی ببینین له خۆشه‌ویستیی بێ خۆشه‌ویست (درودی خودای لێبێت) چی ڕوو ده‌دات، ده‌بێ سه‌یری حاڵی ناخ پڕ له ئازاری ئه‌و كه‌سانه بكه‌ین كه له باوه‌ڕ به‌دوورن... ده‌بێ سه‌یری ئه‌و كه‌سانه بكه‌ین كه به‌ده‌ست چه‌رمه‌سه‌ری و ده‌رده‌سه‌رییه ماددی و مه‌عنه‌وییه‌كان و له‌بن باری بێڕه‌حمانه‌ی ئاریشه‌كان ناڵه‌یانه و، په‌ندیان لێوه‌ربگرین. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له‌ناو خۆشویستنه‌كه‌ماندا خۆشه‌ویستیی ئه‌و هه‌یه، بۆیه ئه‌و كه‌سانه‌ی شایانی خۆشه‌ویستین، به‌جۆشه‌وه خۆشمان ده‌وێن. ئه‌وانه‌ش كه هی ئه‌وه نین خۆش بویسترێن، هه‌ستی خۆمانیان پێ به زایه ناده‌ین. له شته زیان به‌خش و حه‌رامه‌كان به‌دوورین و خۆشمان ناوێن. وه‌ك هه‌موو شته‌كانی دی، له خۆشه‌ویستییشدا پێشه‌نگ و ڕێ پیشانده‌رمان هه‌ر پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستمانه(درودی خوای له‌سه‌ر بێ). خۆشویستنه‌كانمان، بۆ ئه‌وه‌ی ڕاسته‌قینه و خاوه‌ن ناوه‌ڕۆك و به‌هێز بن، پێویستیان به‌وه‌یه به خۆشه‌ویستیی ئه‌و بێنه مۆمیا كردن.



# دەنگی نەوەی نویٚ..

## گوڵێکی خۆرهەڵات کە لە خۆرئاوای دێمدا شکۆفەی کردووە

سەرەتا وەك فەرخەیەك لە ترسا هەڵدەلەرزی، دواتر بوو بە بولبول و لە گوڵزارە دوورە دەستەکاندا کەوتە خوێندن... گوێی رادەگرت، پرسیاری دەکرد، سۆراغی دەکرد.

مانگی نیسان بوو. هاودەم لەگەڵ ئەو سروشتەی بێدار دەبووەوە، ئەمیش یەکسەر کەوتە چرپینی ئاوازێکی ئیلاهی.

ویستم گشت پێکەوە بگەین بە تامی ئەم کۆرتا سەراسیمەیە. حەزم کرد میکرۆبی بێ ئومێدیی نێو ناخمان قاو بدەین. لە رێی خزمەت کردن بە گەنجێتی، هاوشێوەی هاوەڵان بێینە جۆش...

فـەرموون ئێـوە و گوڵێـك كـە ژیاوەتـەوە، ئێـوە و دەروونێـك كـە گەیشـتووە بـە ئامـانجی خـەلق. ئـەمڕۆ ڕۆحـم بـاڵی گرتـووە. ئـەمڕۆ جەژنە، زەماوەندە... گەورەترین ئاواتم ئەوەیە هەر وا بە مەحەببەتی خودایی بمێنێتەوە. ئێستا ئەگەر ئامادەن گوێ ڕادێرن بۆ (گوڵجان)ی گوڵی گیـانم و گیـانی گـوڵم. چـونكە ئـەو، وەك یـەكێك لـەو هـەزاران نموونەیەی، دەنگی نەوەی نوێیە. تكایە گوێی بۆ بگرن.

١٩ی نیسانی ١٩٨٩/بەرلین

(كەمێك كورت كراوەتەوە – وەرگێڕ)

مامۆستای ئازیزم!

بەر لە هەر شتێك لە خـودای گـەورە دەپاڕێمـەوە ژیـانێكی پـڕ لـە ئاسوودەیی و كامەرانیت پێببەخشـێت. پێشـی هـەموو شـتێك دوعـای ئەوەت لە خـودا بـۆ دەكـەم، بەهەشـت هـەوار و جێگـەت بێـت. (خـۆ ئەگەر منیش دوعا نەكەم، ئیششەڵڵا تۆ هەر بەهەشتییت)!...

مامۆستا گیان!

لە بەرانبەر (یاداشتنامەی مامۆسـتایەك)دا زۆر سوپاسـت دەكـەم. پێشكەش كردنەكەی سەر كتێبەكەم، دوای ئەوە بینی كە نامەم بۆ تۆ نووسی. خۆی بڕیار بوو هەفتـەی ڕابـردوو نامـەت بـۆ بنووسـم، بـەڵام

لەبەر دەرسەکانم هەلم بۆ نەڕەخسا. لە دواکەوتنی سوپاسنامەکەم، تو خودا بمبەخشە.

خۆت دەزانی وا ئیدی نوێژەکانم دەکەم. خۆی پێشتریش چەند جارێك دەستم بە نوێژ کردن کردبوو. واتە ئەوانەی ئێستاکێ دەیانزانم، پێشتریش گەلێکیانم دەزانی. بەڵام داخەکەم ئەو زانیارییانەم قفلێ درابوون. جەنابت ئەو قفڵەت شکاند و منت گەیاندە حزووری خودا. من تۆم گەلێك خۆش دەوێت، مامۆستا! تا ئێستا نەمتوانیبوو خۆم بەدەستی خۆم ئەو قفڵەی ناخم بشکێنم. دوا جار تۆ توانیت ئەمە بکەیت. چۆن توانیت بیشکێنی، مامۆستا گیان؟! ڕەنگە ئەمە تەنها دانەیەك بێت لەو ڕووداوانەی زوو زوو لەناویاندا دەژی. بۆ من ئەم ڕووداوە گەلێك مانا لەخۆ دەگرێت، مەحاڵە لەبیریان بکەم.

مامۆستا! خۆ خۆت دەزانیت، من حەزم دەکرد ببم بە قوتابییەکت کە هەرگیزا و هەرگیز لەبیرم نەکەیت. ئێ مەبەستم ئەوەیە ببم بە کچت... مرۆڤ «کچ»ی خۆی لەبیر ناکات، بەڵام کاتێك ئەو هەموو کچەی هەبێ مەحاڵە بتوانێ کەسیان لەبیر نەکات، وا نییە؟ بەڵام ئەگەر من بتوانم بگەم بەو بەختەوەرییە چ دڵخۆشییەکە بۆ من! ئێستا ناتوانم وەك پێویست ئەوەی وا لە مێشکمدا گرد و پوختی بکەمەوە. بۆیە باشتر وایە چەند بەشێك لە دەفتەری بیرەوەرییەکەمت بۆ بنووسم:

"ئەم بەیانییە بۆ یەکەم جار گەیشتم بە بەختەوەریی کردنی نوێژی بەیانی. خوایە گیان! شوکر بۆ تۆ... لەپڕ وامزانی بەرماڵەکەم خەریکە دەفڕێ. وا لە ئاسمانەکانم، لە دوور دوورم. چوونە حزووری خودا چەند



خۆشە! خەریکە هەنسکی گریان لە ناخم دەردێ... دەمەوێت لە خۆشیدا بگریم. دەمەوێت هاوار بکەمە ئەم دونیایە: من ڕێی ڕاستم دۆزییەوە، گەیشتم بە خوا گیانم. دە ئێوەش وەرن... خوایە گیان! مامۆستا وەهبیم چ مرازێکی هەیە بۆی حاسڵ بکەیت. لە گەیشتن بە تۆدا من قەرزداری ئەوم. ئەی خوایە! ژیان بێ نوێژ، چەند وشك و برینگە. وشەیەکم دەست ناکەوێ پێی گوزارشت لە خۆشیی و کامەرانیی و جۆش و خرۆشی ناخم بکەم. ئیدی هیچ هێزێك نییە بتوانێت ئەو قفڵەی مامۆستا وەهبی شکاندی، قفڵ بداتەوە. ئیدی بە چوار دەست باوەشم کردووە بە نوێژ و ئیماندا..."

مامۆستا گیان! ئا بەم جۆرە خێرێکی ترتان خستە سەر توێشووی خێرەکانتان. چ دڵخۆشییەکە بۆ ئێوە! بریا هەموو کەسێك بیتوانیبا وەك ئێوە وابێت. ئای مامۆستا! مرۆڤێکی چەندە باشیت،

زۆر دڵخۆشم بەوەی تۆ مامۆستای منیت. بەوەش کە بوومە کچی تۆ، ئا ئەوەندەی تر دڵخۆشم.

بە هەر حاڵ، زۆرم لە کات گرتی. لە کۆتاییدا بە حورمەتەوە دەستەکانت ڕادەمووسم.

کچی خۆت: گوڵجان

تێبینی:

نووسینەکانی ئەسەنگوڵ نییە، سەردەمانێك (کە ئەوەندە لەمێژیش نییە)، منیش لە هەمان بارودۆخدا بووم. کە نامەکەی ئەوم خوێندەوە، خەریك بوو وا بزانم ئەوەی ئەو هاوار و ناڵەیەتی، منم. چونکە ڕێك وەك ئەو بووم. بەڵام شوکر، ڕزگارم بوو. ئیششەڵڵا جارێکی دی شتی وا نە بەسەر من و نە بەسەر کەسی دیدا نایەت، ئامین.



# بۆچی خودا گشت ئەوانەمان ناداتێ
# کە داوای دەکەین؟

## "دوعاتان نەبێ، نرختان چییە؟"

ڕۆژێکی خۆشی بەهار ئاسای زستان بوو. هەم بەهۆی ئەو ڕۆژە خۆرەتاوەی پێشبینییمان نەدەکرد، هەمیش ئەو شەوی بەراتەی ئەو ئێوارەیە چاوەڕێی بووین، جۆشێکیان خستبووە دڵمانەوە لە باس کردن نایەت. کە چوومە پۆلەوە بۆ ئەوەی ئەوەندەی دی سەرنجەکانیان پێچڕ بکەمەوە ئەم پرسیارەکەم کرد:

"– قوتابییە خۆشەویستەکانم! هەڵیبێنن بزانم، من ئەمڕۆ بۆ وا کەیف خۆشم؟"

بەڕاستی وەڵامەکانیان بۆ من بوون بە مایەی کەیف خۆشی... چونکە زۆرینەی پۆل وتیان: "مامۆستا! ئەم شەو یادی شەوێکی پیرۆزە!"...

وەلیٚ ئەوانەی دەیانزانی یادی چ شەوێکی پیرۆزە، نەختێ کەمتر بوو. لەوانەی کە وتیان: "یادی شەوی بەراتە" بەسەرە پرسیم:

"- مانا و گرنگیی شەوی بەرات چییە؟ دەبێ لەم شەوەدا چی بکرێت؟"

دەمدی ژمارەی ئەو دەستانەی بەرز دەبوونەوە وردە وردە لە کەمیی دەدا. دوا جار، واتا و گرنگیی ئەم شەوەمان لە دوو خاڵدا کۆ کردەوە:

١- لەم شەوەدا لێپرسینەوەی ساڵی ڕابردوومان لەگەڵدا دەکرێت. واتە چاکە و گوناهەکانی ساڵی ڕابردوو -لە شەوی بەراتی ساڵی ڕابردووەوە تا ئەم شەو- حیساب دەکرێت. بەم جۆرە دەردەکەوێت قازانج و زەرەری مەعنەویی ساڵی ڕابردوومان چەنێك بووە. ئەوە نییە دەزگا بازرگانییەکان ساڵی جارێك جەردی زەرەر و قازانجی ئەو ساڵە دەکەن... ئا وەك ئەوە ئێمەش لە شەوی بەراتدا جەردێکی خێر و گوناهی ساڵێکمان دەکەین. بەڵام دەتوانین بە پەرستش و پاڕانەوە لەم شەوەدا، لە دوا ساتدا بارودۆخەکە بۆ بەرژەوەندیی خۆمان بشکێنینەوە. دەکرێ ئەم حاڵەتە بەو گۆلانە بچوێنرێت کە لە دوا خولەکی یاریی دووگۆڵیدا دەکرێن. ئەو قورئان خوێندن و نوێژ و پاڕانەوە و لالانەوانەی بەدڵ لە شەوی بەراتدا دەیانکەین، بۆی هەیە تای خێر و چاکەکانمان قورس بکەن. بەم جۆرە ئەو ساڵەی کە

خەریکە دەیدۆڕێنین، لە دوا ساتدا دەیبەینەوە. شەوی بەرات هەلێکی وا بۆ موسوڵمانان دەڕەخسێنێت.

٢- خودای گەورە لەم شەوەدا ڕۆزیی ساڵی داهاتووی بەندەکانیشی دیاری دەکات. واتە پرسیارگەلی کێ چەنێك دەخوات و دەخواتەوە، کێ نسیبی لە دونیا نامێنێت و ... هەموو پرسیارەکانی هاوشێوەی ئەمانە لەم شەوەدا وەڵامیان دەدرێتەوە. لە شەوێکی وادا کە بڕ و ماوەی ڕۆزیمان دێتە دیاری کردن، گرنگی پێ نەدان و خۆ لێ گێل کردن، بێگومان هەڵەیە. هەق وایە ئەم شەوە بە پەیماندان بە وازهێنان لە خووە خراپەکانمان و ڕووکردنە ئەنجامدانی چاکەی زیاتر، بەڕێ بکەین. دەبێ داوای ڕۆزیی زیاتر و بەبەرەکەتتر لە خودا بکەین...

***

کە گفتوگۆکەمان بەم جۆرە درێژەی دەکێشا، عەدنان دەستی هەڵبڕی. پرسیارەکەی سەرنجی ڕاکێشام. وتم ئەگەر حەز دەکەن با ئەو بابەتەتان بۆ باس بکەم. بینیم باسەکە جێی سەرنج و گرنگی پێدانیان بوو. پرسیارەکەی عەدنان ئەمە بوو:

- مامۆستا ! من ئەوە دوو ساڵە لەو شەوەدا دوعا دەکەم و داوای چەند شتێك دەکەم، بەڵام ئەو هەموو کاتە تێپەڕیوە کەچی هێشتا هیچ یەکێکیان نەهاتوونەتە دی. ئەمە لە کاتێکدایە کە تۆ دەڵێی هیچ دوعایەك بەفیڕۆ ناچێت و هەر وەڵامی دەدرێتەوە. ئینجا کتێبێکی

دوعاشم کرِی، دوعاکانی ناو ئەوەشم تاقی کردەوە، بەڵام دیسانەوە هیچ ئەنجامێکم دەست نەکەوت. پێم ناڵێیت ئەوە بۆ دوعای من قبووڵ نابێت؟ بۆ خودا ئەوەی من داوای دەکەم نامداتێ؟"

– ئافەرین عەدنان! پرسیارێکی زۆر جوانە. پرسیارێکیشە هەر دەبێ لێی تێبگەین. ئێستا دەبێ خۆتان وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە. بیری لێبکەنەوە و وەڵامەکەی بدۆزنەوە. ئەو کات دەردەکەوێت ئێوەش وەڵامی پرسیارەکەی عەدنان دەزانن...

بەڵێ، ئێستا من پرسیارێك دەکەم باسەکە بکاتەوە:

– ئەرێ خودای گەورە قەت دوعاکانمان قبووڵ ناکات؟ واتە ئایا هیچ شتێك نییە ئێمە حەزمان لێی بێت و کەیفمان پێی بێتەوە ئەو دابێتی پێمان؟ ئەگەر لە ئاست ئەم پرسیارەدا بێژن: "بەڵێ"، ئەوە دەردەکەوێت کە هەر بەڕاستی هیچ داخوازییەکمان نەهاتووەتە جێ... وەلێ ئەگەر وەڵامەکەتان "نەخێر" بێت، ئەو کات پێویستە سەرلەنوێ بیربکەینەوە...

پرسیارەکەم دووبارە دەکەمەوە: **"ئایا خودای گەورە هیچ شتێکی نەداوینێ حەزمان لێی بێت و کەیفمان پێیدا بێتەوە؟"**

ژمارەی ئەوانەی دەیانویست قسە بکەن خەیلێ زۆر بوو. بەسەرە وەڵامەکانیانم وەرگرت:

– خودای گەورە زۆر شتی پێبەخشیوین. زۆر لەو شتانەشی پێی بەخشیوین، حەزمان لێیانە.

– خودا، بوون به مرۆڤی بەنسیب کردووین. به بێ گیان یا ڕووەك یا ئاژەڵ نا، بەڵکو به باڵاترین گیانەوەر که مرۆڤه، دروستی کردووین.

– خودا دایك و باوکی خۆشەویستمانی پێداوین.

– تەندروستیی پێبەخشیوین.

– ئەقڵی داوینێ.

ئێستا له گشت ئەم وەڵامانەوە، چ ئـەنجامێك هەڵئـەهێنجین؟ ئایا خودای گەورە ئەو شتانەی حەزمان لێیانە و لامان خۆشەویستن، پێی بەخشیوین یان نا؟

مۆڵەتی قسەکردنم دایە چاودێری پۆل:

– مامۆستا! خـودا ئەوەنـدە شـتی پێبەخشـیوین کـه لـه ژمـاردن نایەن، ئینجا لەو شتانەش که حەزمان لێیانه و بێ ئەوەش که خۆمان داوامـان کـردبن و تەنانـەت لـه کاتێکیشـدا کـه نـەمانزانیوه داوایـان بکەین. خۆ ئێمـه ئـەو دەمانـه هـەر نـەمانتوانیوه بـه ئـەقڵ و زانینـی خۆمان بـیر لـەو هـەموو جوانییـه بکەینـەوه و داوایـان بکـەین... ئـەو خوایـه ئـەو جوانییانـەی پێبەخشـیوین لـه کاتێکدا کـه ئێمـه بیرمـان لێنەکردوونەتەوه و بگره هـەر بـه خەیاڵمانـدا نـەهاتوون، بـەر لـەوەی ئێمه داوایان بکەین و تەنانەت فێربووبین داوا بکەین.



- ئـەی ئافـەرین، چـاودێر!... تـۆ چـاودێرێکی ڕاسـتەقینەیت. پەنجەت لەسەر خاڵێکی زۆر جوان دانا.

سەیرم کرد محەمـەدی فەیلەسـووف وەك بلێـی ئێرەیـی بـەو پێدا هەڵگوتنە دەبرد. لەبەر ئەوەی هەستم بەوە کـرد، سـەیری محەمـەدم کردو وتم:

- تۆ لە بەرانبەر قسەکانی کاکی چاودێردا چی دەڵێیت؟

- بەڵێ، مامۆستا! چاودێر هـەر بەڕاستی پەنجـەی خسـتە سـەر خـاڵێکی زۆر سـەرنج ڕاکـێش... ئـەوەی ڕاسـتی بێـت ئـەوەی پەروەردگارمان پێی بەخشیوین، تەنانەت بۆ ئەوەش خۆمان داوایـان بکـەین، گـەلێك گـەلێك زۆرن... هاوڕێکـانم هـەوڵیان دا بیانـژمێرن... بەڵام گرنگترین شتێك کـە خـودای گـەورە پێـی داوین، کـەس باسـی نەکرد.

لەسەر ئەم قسەیەی محەمەد، پۆل دەنگی لێ بەرزبووەوە:

- مێشك
- باوەڕ
- قورئان
- چاو
- قسەکردن

بەڵام محەمەد هیچ یەکێك لەم وەڵامانەی بەدڵ نەبوو و داوای دەکرد ئەو شتە بدۆزنەوە کە خودای پێی داوین و لە گشت ئەمانە بەنرخترە. دوا جار پۆل شەکەت بوو و پێیان وت: "دە مادام خۆت بیلێ"... محەمەدی فەیلەسووف وەك گشت جارەکانی تر، چووەوە سەر چەتوونییە خۆش ئاوەزەکەی و حاڵە سەرنج ڕاکێشەکەی... ئاوا لە بەرزییەکەوە سەیرێکی دەوروبەرەکەی کرد و هێدی هێدی هاتە گۆ:

- یەکێك لە جوانترین و بەنرخترین و گرنگترین ئەو شتانەی خودای گەورە بە ئێمەی داوە، ئەوەیە کە فێری داواکردنی کردووین. مادام داواکردنی داوە، کەواتە دەشیەوێت بدات.

زمانی حاڵی محەمەد کە چاوی دەگێڕا بەنێو ئەو بێدەنگییەی لە پۆلدا هاتە ئاراوە، وەك بڵێی دەیوت: "چۆن بوو؟".

- ئەمە باسێکی فرە گرنگ و هەست بزوێنە... بەڵام پێم وایە تۆ ئێستا ئەمەت بۆ نەهات.

– ڕاستە، مامۆستا! ئەم وتەیە هی پیاوێکی مەزنە بە ناوی ئیمامی ڕەببانی...

– ئافەرینێکی زۆر بۆ محەمەد... بەڕاستی تیشکی خستە سەر مەسەلەیەکی زۆر گرنگ و جوان. ئەگەر بمانەوێت ئەوەی تا ئێستاکە وتوومانە کورت و پوخت بکەینەوە، دەبێ چ بڵێین؟..

١– مانای وایە خودای گەورە خۆی چەندین شتی پێداوین، بە هۆی دەست کراوەیی و بەخشندەیی و خۆشەویستیی بێسنووری بۆ ئێمە شتانێکی جوانی بێشوماری –بێ ئەوەی خۆمان داوایان بکەین– پێداوین. زێدەباری ئەوەش بۆ ئەوەی زیاترمان پێ بدات، فێری داواکردنی کردووین. بەڵێ هەر بەڕاستی "ئەگەر نەیویستایە بدات، ویستنی نەدەدا".



٢– "بۆچی خودا ئەوەی داوای دەکەین نامانداتێ؟"، پرسیارێکی هەڵەیە. چونکە ئێمە هەر لە بوونماندا قەرزداری ئەوین. واتە: ئەو ئێمەی هێناوەتە بوونەوە و لە دونیای نەبووندا نەیهێڵاوینەتەوە. ئێمەی وەك بێ گیان یا ڕووەك یا ئاژەڵ نا، بەڵکو وەك بالاترین زیندەوەر کە مرۆڤە، خولقاندووینی. سەرجەم ئەندامە ناوەکی و دەرەکییە جوان و گونجاوەکان و مرۆیەتی و هەست و بیری پێداوین. گشت ئەو هەلومەرجانەی بۆ درێژەدان بە ژیان وەك مرۆڤ پێویستن،

بەخۆڕایی پێی داوین. بۆ نموونە: با بیرێك لە هەوا بکەینەوە کە بۆ درێژەدان بە ژیان گەلێك پێویستمان پێیەتی. ئەو هەوایەی کە بۆ ژیان پێویستمان بە هەم وەرگرتن و هەمیش دانەوەیەتی، مەگەر بێبەرانبەر نییە؟! ئەگەر وەك بەنزینی ئۆتۆمبێل، ئێمەش پێویست بوایە لە وێستگەی هەوادا بە پارە بمانکڕیبایە، ژیان چەند زەحمەت دەبوو، ئەی وا نییە؟!

٣- پەروەردگارمان پێویستییە بنەڕەتییەکانی ژیانمان بێبەرانبەر بۆ دەکات بە دیاریی. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمەی مرۆڤ بۆ ئەوەی بەخشایشەکان فرەتر بن لەبەری دەپاڕێینەوە. هەر وەك ئەو کەسەی کە پێویستییە بنەڕەتییەکانی خۆی دابین کردووە، ئیتر دەکەوێتە شوێن زیاتریان و باشتریان... مرۆڤ بەردەوام بەشوێن چاکتر و جوانتر و بەهادارترەوەیە. بۆیە بەردەوام پێویستی بە دوعا و پاڕانەوەیە... کەواتە بۆ بەردەوامیی دابین بوونی پێویستییەکانمان، بەردەوامیی دوعاکانمان پێویستە. ئەوەی هیچ پێویستییەکی نەبێ، پێویستی بەوە نابێ لە خودا بپاڕێتەوە. بۆیە هەموو کەسێك هەموو دەمێك پێویستیگەلێکی هەیە بیەوێ پێیان بگات. ئیتر ئەم پێویستییانە ناچارمان دەکەن هەمیشە دەستمان لە دەرگانەی ئەو کراوە بێت و لێی بپاڕێینەوە.

- ئەرێ بەتەواوی لەمە تێگەیشتن؟

ئۆرهان وتی: "بەڵێ، مامۆستا!" و بەدوایدا وتی:

- "ئەگەر خودای گەورە هەر چییەکمان بویستایە دەمودەست پێی بدایناپە، ئێمەومانان دوعامان فەرامۆش دەکرد..."

- باشە، دەشێ ئەوەی دوعاکانمان بەتەواوی یان وەك ئەوەی ئێمە دەمانەوێ نایەنە جێ، چ هۆیەکی دیی هەبێ؟ دەی با لەبەر ڕۆشنایی ئەوانەی تا ئێستا باسمان کردوون بیربکەینەوە... پێنج خولەك مۆڵەت بۆ ئێوە...

بەڵام پێش ئەوەی پێنج خولەکەکە تەواو ببێ، کەسانێك هەبوون دەیانویست بئاخفن. ڕێم دان بدوێن. لە وەڵامەکاندا بۆچوونی زۆر جوان هەبوون. ئێستا با بەسەرە چاو بەو وەڵامە جوانانەدا بخشێنین:

١- ئەگەر هەموو شتێك لە ڕێی دوعاوە - واتە تەنها بە داواکردن لە خودا بهاتنایەتە دی، تەمەڵی و تەوەزەلی ڕووی لە مرۆڤایەتی دەکرد. کەس کاری نەدەکرد، هەر چییەکی بویستایە دەستی بۆ خودا بەرز دەکردەوە. ئەمە لە کاتێکدا خودای گەورە داوامان لێدەکات هەردەم لە کار و جووڵەدا بین و، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانمان چیمان لەدەست بێ بیکەین. دوای ئەوەی چیمان لەدەست بێ دەیکەین، بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی هەمانە لە خودا دەپاڕێینەوە. لە ئاینەکەماندا بەمە دەوترێ: «تەوەککول - پشت بەستن



به خودا».

ئەوەی کە کشتیار عەرزەکەی بەجوانی دەکێڵێ و بەجوانی تۆوی دەکات و پەین و ئاودان و هەر چییەکی تر پێویست بێت دەیکات، دوای گشت ئەوانە و بۆ ئەوەی بەرهەمێکی باشی هەبێ لە خودا دەپاڕێتەوە، نموونەیەکی تەوەککولی ڕاستییە. ئێ خۆ هەموو ئەو کارانەی دەکرێن بۆ ئەوەی بەروبوومی باش بەدەست بهێنرێ، خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە دوعا، دوعایەك کە لە شێوەی کار و بزووتندا دەکرێ...

٢- دونیا مەیدانێکی تاقیکردنەوەیە. کێڵگەیەکە بەرەکەی لەو دونیا دەچنرێتەوە. بۆیە هەر کەسێك لەم دونیایەدا هەوڵێك بدا، خودا دەیگەیەنێت بە سەرکەوتن. خودای گەورە لەم دونیایەدا هەموو شتێکی بە هۆکار و ڕێساوە بەستووەتەوە. هەر چییەك بکەین، وا پێویست دەکات بە شێوەیەکی لەبار بۆی بکەوینە کار. کردنی کاری باش و بەسوود لە هەمان کاتدا بە پەرستشێك بۆ خودا دێتە ئەژمار کە خێر و پاداشتی زۆرە. بۆ نموونە: قوتابییەك کە کۆشش دەکات بۆ ئەوەی پۆلێك بپەڕێنێ، ئەگەر باوەڕدار بێ و پەرستشە بنەڕەتییەکانی خۆیشی بەجێ بگەیەنێ ئەوە سەعی کردنەکانیشی دەبن بە پەرستش و چاکە و خێری دەست دەخەن.

کەواتە هەوڵ دان بۆ گەیشتن بەو ئەنجامەی دەمانەوێ، مەرجێکی گرنگی ئەم تاقیکردنەوەی دونیایەمانە. کەس ناتوانێ تەنها بە دوعای

زارەکی بکات بە سەرکەوتن. چونکە خودای گەوە ئەوەی ڕاگەیاندووە کە چ موسوڵمان، چ شوێنکەوتەی ئاینەکانی دی، کێ دەبێ با ببێ، کێ لەم دونیایەدا کۆشش بکات، ئەو سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت. ئەگەر نا، ئەگەر بهاتایەو ئەو موسوڵمانانەی لە خودا دەپاڕانەوە سەرکەوتن بەشیان بوایە و بێباوەڕانیش وێڕای هەوڵ دانیان سەرکەوتوو نەبونایە، تاقیکردنەوەی دونیا تێکدەچوو.



٣- مرۆڤ داوای زۆر شتی جیا جیا لە خودا دەکات... ئاوات و ئارەزوو و داخوازییەکان ئەوەندە زۆرن، دەگاتە ئاستێك بکرێ پێیان بوترێ بێکۆتا. ئینجا ئەو مرۆڤانەی کە داوا دەکەن، ناتوانن بزانن ئەوەی داوای دەکەن بەڕاستی بۆیان باش و بەسوودە یان نا. مرۆڤ بەپێی ئەقڵ و تێگەیشتن و لێکدانەوەی سنوورداری خۆی داوا دەکات. بەڵام ئەوەی داوای دەکات بۆی باشە یان نا، ناتوانێ ئەمە بەتەواوی بزانێت. تەنانەت هەندێ جار بۆی هەیە شتانێك کە بۆی زۆر زیان بەخشن، بە سوودبەخشیان بزانێ و لەبەر ئەوە داوایان بکات. لەم ڕوانگەیەوە نابێ لە ئاست دوعایەکی گیرا نەبوومان دڵتەنگ ببین. بەڵکو هەق وایە بڵێین: "دیارە ئەوەی داوای دەکەم بۆ من باش نییە".

٤- هەر کەسێك داوای هەرچییەکی بکردایە خوای گەورە پێی بدایە، هاوسەنگیی ئەم دونیایە تێکدەچوو و ژیان دەبوو بە شتێك قابیلی ژیان نەبێت. با تاوێك بیر بکەینەوە: بۆ نموونە، کێ حەزی دەکرد هەژار بێت، یان کرێکارێك بێت بە ئارەقەی ناوچاوانی بژی؟... بێگومان زۆرینەی ڕەهای مرۆڤەکان حەزیان دەکرد دەوڵەمەند و خاوەن خان و کارخانە بن. باشە ئەی کێمان دەست دەکەوت لەو شوێنانە کار بکات؟ دەمانتوانی قەناعەت بە کێ بێنین لە کارخانەدا کرێکاری بکات؟ لە شوێنێکدا هەمووان دەوڵەمەند بن، کردنی هەندێك پیشەی زۆر گرنگ مەحاڵە. بۆ نموونە، سەردەمانێك پاككەرەوەکان لە ئیستەنبووڵ بۆ ماوەیەك مانیان گرتووە، ئەو شارە وا پیس و پۆخڵ بووە نەتوانرێ گوزەری پێدا بکرێ و خەریك بووە لەوە بکەوێ جێی ژیان بێ...

کەواتە ناکرێ نزای دەوڵەمەند بوونی هەموو کەسێك بێتە جێ، وەلێ دەکرێ نزای کامەران بوونیان بێتە جێ. چونکە دەوڵەمەندی یەکێك نییە لە مەرجەکانی کامەرانیی. دەشێ زۆرێك لەو کرێکارانەی لە کارگەیەکدا کار دەکەن، لە خاوەن کارگەکە کامەرانتر بن و ژیانیان پتر پڕ لە خۆشی بێت.

٥- دوعا خۆی بۆ خۆی یەکێکە لەو جوولە خۆشانەی مرۆڤ دڵخۆش دەکەن... ئەو کەسەی دوعا دەکات هەست بەوە دەکات کەسێك هەیە ئاگای لە دەنگی و ئەو هەستە هەیە کە بە دڵیدا دەگوزەرێ. ئەویش

هەر کاتێك دەستی بەرز دەکاتەوە، ئەو دەبیستیٚ. بە سۆزێکی واوە ئەوی خۆش دەویٚ کە لەگەڵ خۆشەویستی دایکیشیدا بەراورد ناکریٚ. سەرباری ئەوەش، زانست و توانست و بەدیهێنەریی بێکۆتایە. ئەو ئاسوودەییەی دەست کردنەوە بۆ خودایەکی وا و پاڕانەوە و لاڵانەوە لەبەری دەیبەخشێتە دڵ و دەروونی مرۆڤ تەواو جیایە. ئەو تامەی پەیوەست بوون بەو خودایەی هەر کاتێك لەبەری بپاڕێیتەوە دەیبیستیٚ و گیرای دەکات دەیدات بە ڕۆحمان، تەنها لە ڕێی دوعاوە دەتوانریٚ پەی پێببریٚ.

٦- نابیٚ لە بەرانبەر ئەو دوعایانەی نایەنە جیٚ، وا بیربکەینەوە و بڵێین وەڵاممان نەدرایەوە یان گیرا نەبوو، چونکە هەندیٚ جار نزاکانمان وەك ئەوەی ئێمە داوای دەکەین نایەنە جیٚ، بەڵکو لە شێوەیەکی باشتر و گونجاوتردا دێنە قبووڵ کردن، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم حاڵەتە بەپێی ئارەزووی ئەو کاتمان نەبووە، زویر دەبین و بگرە هەندیٚ جار پێمان قبووڵیش ناکریٚ. بەڵام دوای ماوەیەك دەبینین ئەوەی داوامان کردووە بۆمان باش نەبووە... هەندیٚ جاریش شتێك کە ئێمە بۆ ئەم دونیا فانییە داوای دەکەین، بۆ جیهانی پەسلانی جاویدانی و نەمری، گیرا دەکرێت. ئێمەش دێین و وای لێك دەدەینەوە کە دوعاکەمان وەڵام نەدراوەتەوە... ئەوەی شتە کاتییەکانی لەدەست چووە، بەڵام نەبڕاوەکانی چنگ کەوتووە

قازانجی کردووه نەك زەرەر. دوعایەکی وا نەك گیرا نەبووە، بەڵکو بە شێوەیەکی زۆر باشتر گیرا بووە.

٧- دوعا بەندایەتییە، بۆیە پەرستشێکە پاداشتی زۆری بەدواوەیە. ئامانجی سەرەکیش لە پەرستشەکان بردنەوەی ڕۆژی دواییە. واتە پێویست ناکات ئەنجامی هەموو پاڕانەوەیەك تەنها لە دونیادا ببینین. هەندێ لە کەڵە پیاوە پێگەیشتووەکان، تەنانەت داوای ئەوەشیان نەکردووە بخرێنە بەهەشتەوە، بەڵکو وتوویانە: "بەس خودا لێمان ڕەزا بێت، بەسە". بێگومان ئەمە پایەیەکی ئەوەندە بەرزە، هەموو کەسێك نایگاتێ.

٨- ئەرێ ئێمە دوعاکانمان بەپێی ڕێسا و بنەماکانی دوعا دەکەین؟ وەك هەموو شتێك، دوعاش هەندێك بنەما و ڕێسای تایبەت بە خۆی هەیە. ئایا پابەندی لە فەرمانەکانی ئەو خودایە دەکەین کە لێی دەپاڕێینەوە؟ یان چی ئەو قەدەغەی کردووە دەیکەین، دوای ئەوەش دێین دەست دەکەینەوە و دەکەوینە پاڕانەوە و داواکردن لێی؟ ئەوەتا پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) ئاماژە بەوە دەدات کە نزای کەسێك گیرا نابێت لوقمەی حەرام بێت.

ئەمە جگە لەوەی لەنێو پەرستشەکانی وەك نوێژ و ڕۆژوودا گیراترین دوعاکان هەن. ئەو دوعایانەی لە هەندێك شەو و ڕۆژی پیرۆز و لە هەندێك شوێنی پیرۆزی وەك کەعبەدا دەکرێن، لە دوعا گیراکانن.

پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) لە فەرموودەیەکیدا فەرموویەتی: "بە زاری بێ گوناهەوە دوعا بکەن". لێیان پرسیوە:

**– ئایا ڕێی تێدەچێ کەسێك هیچ گوناهێکی نەبێت؟**

فەرموویەتی:

**– "ئەگەر دوعا بۆ یەکتری بکەن، ئەوا بە زاری بێ گوناهەوە دوعاتان کردووە. چونکە تۆ ناتوانی بە ناوی کەسێکی ترەوە گوناه بکەیت..."**

بەم جۆرە پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) وەك چۆن لە گشت کارێکی خێردا داوای کردووە یارمەتی یەکدی بدەین، لە مەسەلەی دوعاشدا هەمان ئامۆژگاریی کردووین.

***

– بەڵێ، کەسی تر هەیە لە بابەتی دوعادا پرسیارێکی هەبێت؟

کە ئەم پرسیارەم ئاڕاستە کردن، زەنگیش لێی دا. پرسیارەکانمان بۆ کاتێکی تر هەڵگرت. بەڵام عەدنان –ئەوەی کە پرسیارەکەی کرد– هەر زۆر بەکەیف بوو، وتی:

– مامۆستا! دوعا زۆر لەوە فراوانتر بوو کە من بیرم لێکردبووەوە... ئەو پرسیارانەی لە مێشکمدا بوون، بەتەواوی وەڵامدرانەوە...

# نزای سەگ



هەمیشە بیرم لەوە کردووەتەوە تۆ بڵێی ئەگەر لە زمانی ئاژەڵان تێبگەیشتینایە چی ڕووی دەدا؟... یان ئەگەر ئەوان بیانتوانیایە بیربکەنەوە و بێنە گۆ، چییان بە ئێمە دەوت؟ ئایا ئاژەڵانیش حەزیان دەکرد سەردانی «باخچەی مرۆڤان» بکەن؟ سلێمان پێغەمبەر(سەلامی خوای لەسەر بێ) زمانی ئاژەڵانی زانیوە... شتێکی چەند سەرنج ڕاکێشە، وا نییە؟! لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا کەسانێك هەن لە هەوڵی ئەوەدان لە زمانی هەندێك لە ئاژەڵان بگەن. بەتایبەت نەهەنگ کە تەنانەت دەستیان کردووە بە قسەکردنیش لەگەڵیدا... چونکە نەهەنگ ئاژەڵێکە زۆر لە ئادەمزادەوە نزیکە.

هەندێك لە پیاوە مەزنەکان، مانای زۆر گەورەیان لە دەنگی ئاژەڵان دەرهێناوە. بۆ نموونە بەدیعوززەمان ئاماژە بەوە دەدات کە مرەمرِی پشیلە بە مانای "یا رب، یا رحیم!" دێت.

بەڕێز خاتوو (حیکمەت ئۆغوت) کە بە دایکی مەعنەویی خۆمم داناوە، بە ئیلهام وەرگرتن لە ئەبوو هورەیرە، گەنجینەی خۆشەویستییەکەی نێو دڵی بۆ ئاژەڵانیش دەکردەوە. نەك هەر پشیلەکانی خۆی بەڵکو چی مەخلووقاتی خودا هەیە، لەبەر خالقیان

خۆشی دەویستن. حەز دەکەم نووسراوێکی بە ناوی: «دوعای سەگ» کە لە دانیشتنێکماندا پێی دام، پێشکەشی ئێوەی بکەم. پێم وایە ئێوەش بەقەد من بەدڵتان دەبێت:

"ئەی ئەو خودایەم کە فەرمانڕەوای گشت مەخلووقاتی!

بەقەد ئەو ڕاستگۆییەی من لە بەرانبەریدا هەمە، خاوەنەکەم کە مرۆڤە وا لێبکە بەردەوام بێت لەسەر ڕاستگۆیی بەرانبەر هاوڕەگەزەکانی...

وەك چۆن من پەیوەست بوومە بەوەوە، وا لەویش بکە بە مەحەببەتەوە پەیوەست بێت بە ماڵیات و دۆستەکانییەوە...

وەك چۆن من پارێزگاری لە موڵك و سامانی ئەوان دەکەم، وا لەوانیش بکە ببن بە پارێزەرێکی بەئابڕووی ئەو بەخشایشانەی پێت داون...

خودایە وەك چۆن کلکی من ئامادەیە بۆ بادان، وا لەوانیش بکە هەمیشە ئامادە بن بۆ بزەی لێوان...

وەك چۆن من ئامادەم بۆ لێسینەوەی دەستی ئەوان، وا لەوانیش بکە پەی بە قەرزداریی شوکرانەیان ببەن...

وەك ئەو تەحەممولەی من هەمە بۆ چاوەڕێ کردنی گەڕانەوەیان بێ ئەوەی هیچ گلەییەك بکەم، وا لەوانیش بکە ئارامگربن. ئەو بوێری و دڵسۆزییەی من لە بەخت کردنی ئاسوودەیی و ڕەحەتی و تەنانەت ژیانی خۆم لە پێناویان پیشانی دەدەم، بەنسیبی ئەوانیشی بکە.

ئەی ئەو خودایەم کە فەرمانڕەوای گشت مەخلووقاتی!

وەك چۆن من هەمیشە بە سەگی دەمێنمەوە، وا لەوانیش بکە هەمیشە بە مرۆیی بمێننەوە..."

## دوعای مامۆستایەك

## بۆ قوتابییە ڕێبوارەکەی

ئیششەڵڵا ئەو ڕێیانەی تۆ بۆیان دەچی، ئەوان بۆت دێن. خوازیارم با هەمیشە لە دواتەوە هەڵبکات. دەخوازم هەر جارێك کە هەڵدەکات، چارۆکەی بەلەمەکەت پڕ بکات و ئاسانکاریت بۆ بکات.



خۆریش هەمیشە دەموچاوت گەرم و ڕێشت ڕۆشن بکاتەوە. ڕووناکیی ناخت کوژانەوەی نەبێ و لە گشت شوێنێك ڕێ پیشاندەرت بێ. بارانیش بەنەرمی داباریتە سەرت و هیچ شتێك ئازارت پێنەگەیەنێ.

تا ئەو کاتەی پێك دەگەینەوە، پەروەرگار بتپارێزێ! ئامین...



# ئاشتی خووی باوەڕدارە

## بەندەکانی خودا ببن بە برا !

پێشان سوڵحیان پێدەوت، ئێستا پێی دەڵێن ئاشتی. ناوی چی دەبێ با ببێ، ئەم چەمکە کە (سەلامەت و ئەمنیەت)ی دەگەیەنێت، بەتەواوی لامان بووە بە شتێکی نامۆ. خودا ستەم لە بەندەکانی ناکات. کەواتە لەبەرئەوەی بەندەکانی نەیانتوانیوە شایانی ئەو جوانییە بن، بۆیە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لە دەستی دەدەن.

ئاشتی خووێکە. سازانی ئەم خووە لەگەڵ بونیادمان لە ڕێی ئایەتی ﴿وَ الصُّلْحُ خَيْرٌ﴾ەوە ڕوون کراوەتەوە. ئەگەر سوڵح خێر بێت، ئەوا شەڕیش شەڕە. مرۆڤایەتیی ئەمڕۆمان لە سایەی ئەم شەڕەدا حاڵی پەشێوە.

لە دونیایەکدا کە وڵات لەگەڵ وڵات، پۆل لەگەڵ پۆل، تیرە لەگەڵ تیرە، خێزان لەگەڵ خێزان، تاك لەگەڵ تاك و تەنانەت تاك لەگەڵ

خودی خۆیدا لە شەڕ و ناخۆشیدا بێت، ئایا گەڕان بەدوای بەرەکەتی ئاشتی، خولانەوە نییە لە بازنەی بۆشدا؟

شەڕیش هەر خوییکە. ئەو مرۆڤانەی خوویان بە شەڕەوە گرتووە و خاوەن کەسایەتییەکی ڕقاوین، ئەو مەیدانە خالّی لە ئاسوودەیی و متمانە و نەرم و نییانەی دەیخەنەوە، پیسترین کەشوهەوایەکە کە هەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەکات. پیسیی ئەو کەشوهەوا مەعنەوییە کە ڕێ بە هەناسەدان نادات، شەڕ و خوێن و قین و دووبەرەکی بۆ هەموو شوێنێك دەگوازێتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە مرۆڤەکان هەمیشە بۆ شەڕ دەست لەسەر سنگن. ئەمە لە کاتێکدا کە ئاشتیی، ئارامیی و لێبوردەیی کاری ئەون. مرۆڤە بێ ئارامە تەنگەزارەکانیش، ئەو مەملەکەتی ئاشتی و ئارامییەی نەیانتوانیوە لە ناخی خۆیاندا دروستی بکەن، چۆن دەتوانن بۆ دەرەوەی خۆیان بیگوازنەوە؟!

## ئاشتی پێکەوە هەڵکردنە

ئاینی ئیسلام کە گشت ڕێیەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ بارودۆخە ئەرێنی و نەرێنییەکانی بۆ دیاری کردووین، عادیلانەترین ڕێی پێکەوە هەڵکردن و سازانە.

لەم ڕوانگەیەوە، ئەوانەی بەڕاستی دەیانەوێ مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی و جڤاکەکەیدا بسازێنن، پێویستیان بە ئیسلامە. ئەوەتا

باپیرانمان بەجوانترین شێوە ئەم ڕاستییەیان بەرجەستە کردووە و سەلماندووە. بۆ نموونە: توانیویانە بۆ چەندین سەدە لە قودسدا مزگەوت و کڵێسا و کەنیشتە (پەرستگای جووان) بەپاڵ یەکەوە جێ بکەنەوە. کەچی ئێستا لەسەر ئەو خاکە، قین و خوێن و جەنگ بە هەموو شێوازێکی ئاشکرا و شاراوە درێژەیان هەیە. وای لێهاتووە جەنگی نێوان موسوڵمان–موسوڵمانیش دەستی پێکردووە. هیچ گومانێکی تێدا نییە ئەو ئیسلامەی کە ئاشتی و ئارامیی بۆ بیروباوەڕەکانی تریش هاوردووە، بەتەواوی لەم قرێژی و کێماسییە بێبەرییە. چونکە ئەو خەبەرە ئیلاهییەی جاڕی ئەوەی داوە کە: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ واتە: (گشت باوەڕداران بران)، بە پەسندانەوە یادی ئەو پشت یەك گرتنەی موهاجیرە مەککەیی و ئەنسارە مەدینەییەکان دەکاتەوە.

هەمدیس قورئانی پیرۆز کە کەلامی خودایە، ڕوونی دەکاتەوە:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَ أُنثَى وَ جَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَ قَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات:١٣

واتە: «خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لە پیاو و ژنێك (کە ئادەم و حەوان) بەدیهێناوە. کردووشمانن بە چەند گەل و خێڵێك تا یەکدی بناسن. گومانی تێدا نییە کە بەقەدر و حورمەتترتان لای خودا، ئەوەتانە کە لە هەمووتان بەتەقواترە».

سەردەفتەری پێغەمبەرانیش (درودی خودای لێبێت) بەو دەنگەی کە تا دێ تازەتر و پێویستتر دەبێ، بەر لە ١٤ سەدە دەفەرموویت: «يا عباد الله! كونوا عباد الله إخوانا»، واتە: **"ئەی بەندەگەلی خودا! هەمووتان بین بە برای یەکتر"**.

## شەڕ لە پێناوی ئاشتیدا



ئیسلام ئاینێکی هێند ئاشتی ویستە، کە شەڕەکانیشی دوا چارەن و بۆ فەراهەم هێنانی ئاشتین. بۆیە بۆ شەڕەکانیش، ئینسانییەت و دان بەخۆداگری و لێبوردەیی و ویژدانی هێناوە. ئیسلام کە شەڕ تەنها وەك هۆکارێك بۆ لابردنی کۆسپەکان و داکۆکی لە خۆکردن دەبینێ، لە بەرەی بەرگرییە نەك سنوور بەزاندن. بەردەوام یەکەم هەڵمەت لە دوژمنەوە چاوەڕێ دەکرێ، موسوڵمان تا یەکەم هەڵمەت یان بەڵگەی بیرۆکە و پلان و ڕێکاری هەڵمەت بۆ هاتن نەبینێ، دەست بۆ شەڕ نابات...

پێغەمبەرمان (درودی خودای لێبێت) فەرمانی داوە ژن و منداڵ و بەساڵاچوو و پیاوی ئاینیی دوژمن – کە چەکیان هەڵنەگرتووە– لە دەرەوەی بازنەی شەڕ بهێڵرێنەوە، ئەوەشی وتووە کە دار و ئاژەڵیشیان نەبڕرێنەوە.

"ئەو زاتە بەو سوپایەیەوە کە ١٠ ساڵ و شتێك فەرماندەیی کرد، ملیۆن و نیوێك چوار گۆشە ئەرزی فەتح کرد. ژمارەی ئەو دوژمنانەی کە هاتوونەتە کوشتن، لە دەوری ١٥٠ کەسێکدایە."

هەق وایە ئەم ڕاستییە ئەو کەسانە خەجاڵەتبار بکات کە ئیسلام بە ئاینی شمشێر دەبینن. چونکە نابێ ئەوانەی کە ناتوانن تەنانەت لە ئاشتیشدا نیزامێکی برایانە بێننە ئاراوە، تێگەیشتنێك کە جەنگیش جوان دەکات و لە دڕندەیی دەریدێنێت، بە توندوتیژ دابنێت.

## پێنج پایەکەی ئیسلام

### مرۆڤ دەگەیەننە هەرێمی ئاشتی

ئیسلام لە ڕێی پێنج پایەکەیەوە، لەنێو دونیای ناوەوەی مرۆڤدا، هەرێمێکی خۆشی ئاشتیی بنیات ناوە.

لە ڕێی شایەتمانەوە مرۆڤی کردووەتە بەندەی خودای تاقانە و بەم جۆرەش لە بەندایەتیی گشت بوونەوەرانی دی ڕزگاری کردووە. مرۆڤ بەو هەستەوە دەجووڵێتەوە کە ئەوەی ئەوی خولقاندووە،

گشت بوونـەوەرەکانی دیکەشـی خولقانـدووە، بۆیـە لەگـەڵ جیهـانی گشت بوونە گیاندار و بێگیانەکان نزیکی و پەیوەستیی دامەزراندووە. یوونس (ئەمرەی شاعیر) وتەنی: "لە بەرانبـەر مـەخلووقات لێبـووردە بە، لەبەر خاتری خالق...".

ئا ئەم ناوەندی لێبووردەییە، بنچینەی خـووی ئاشـتییە. ئەوانـەی هەست بەوە دەکەن کە گشت بەندەی خودان و، چی جۆرە بـاڵایی و ئیمتیازێکی دەستکرد لەنێوانیاندا هەیە وەلایان دەنێن، ئا ئەوانەن کە یەکەم هەنگاو دەنێنە نێو دونیای ئاشتییەوە، چونکە ئـەوەی ئاشـتی دەشێوێنیّ، دووبەرەکی و جیاوازییە. لـەبن لێـك تێنەگەیشـتنەکانیش ناهەقی و خۆبەگەورە و باڵاتر زانین هەیە.

نوێژ کەشێکی ئەم هەرێمی ئاشتییەیە. ڕۆژی بە لایەنی کـەم پێـنج جار وا لە موسڵمان دەکات هۆگری هێشتنەوەی ئاشتی و دادپەروەری بێـت. بەتایبـەت ئەگـەر لـە مزگەوتـدا بکـریّ، ئـەوە فەرمانـدار و فەرمانبەر، پرۆفیسـۆر و پیشـەوەر، هـەژار و نـەدار بـەپاڵ یەکـەوە و شان بەشانی یەك ڕادەگرێت و ئەو هەسـتەیان لا دروسـت دەکـات کـە ئەوان بەندەگەلێکن هیچ جیاوازییـەك لـە نێوانیانـدا نییـە. بـەوەی لـە هەمان سەف و لە هەمان پەرستشدا دەوەستن، یەکسـان دەبن. بـەم جـۆرە ئاشـتی وەك بونیـادێکی بنچـینەیی دەچـێتە نـاخ و مـۆخی مرۆڤەوە.

پلێژوو لووتی بەرزی ئەو نەفسانەی بوون بە فیرعەون دەدات بە زەویدا، کلۆڵی و بێهێزیی خۆیانیان بیر دێنێتەوە و تەلقینی ئەوەیان دەدات کە ئەوان بەندەن. بەم جۆرە مرۆڤ ئەو هەستی خۆ بەگەورە زانینەی هەرێمی ئاشتی دەشێوێنێ، دەخاتە ژێر پێ.

هەرچی زەکاتیشە، ئەوە گەورەترین پردی نێوان دەوڵەمەند و هەژارە. یاخی بوون و شەڕ و داگیرکاری لەبەین دەبات.

ئەگەر بێینە سەر حەجیش، ئەوە مەزنترین نموونەی ئەوەیە کە تەواوی ئەو مرۆڤانەی ڕەنگ و ڕەگەز و زمانیان جیایە، لە دەوری کەعبە وەك یەك جەستە و یەك دڵیان لێدەکات. ئەو مرۆڤانە کە دەبن بە خاوەنی یەك دەروون و لەنێو هەمان جلوبەرگدان و هەمان دوعا دەڵێنەوە و بەم جۆرە دەبن بە یەك، ئەی مەگەر ناکات شەقیان لە جیاوازییەکان هەڵداوە و بەو هۆیەشەوە خۆشترین ئاشتی ژیاون؟

ئا بەم جۆرە، بەهۆی دووبارە کردنەوەی بەردەوامی ئەم پێنج پایەیەی ئیسلام، ئەم ئاشتییە بۆ موسوڵمان دەبێت بە خوو و مۆراڵ و دەچێتە ناو کەسایەتییەوە. کە واش بوو، ئایا ڕێی تێدەچێ باوەڕدار شەڕانی و تەفرەقەچی بێت؟ ئەوێك کە لەگەڵ ئەو پەروەردگاری جیهانییانەی خولقێنەری هەموو شتێکە لە ئاشتیدایە و شەڕیشی تەنێ لەگەڵ ئەو شەیتان و کەسە بوو بە شەیتانانەدایە کە مرۆڤ بەرەو قین و خوێن هەڵدەنێن – واتە لەگەڵ ئەوانەی کە ئاشتی

و ئارامی لە بەین دەبەن و، لە پێناوی ئەوەشدا کە کۆسپەکانی ڕێی ئاشتی هەڵبگرێ.

## شتێك فانی بێ،
## هی ئەوە نییە شەڕی لەسەر بکرێ

ئاشتی خووی باوەڕدارە. چونکە حەزی نییە لە خۆپەرستی و ناهەقی و هەستی بالآیی و ستەم – کە ئاشتی دەشێوێنن و دەبن بە مایەی شەڕ. لە بنجدا بۆ موسوڵمانێکی کامڵ هیچ بوونێکی دونیایی نابێتە هۆی شەڕ، چونکە ئەوەی فانی بێ، هی ئەوە نییە شەڕی لەسەر بکرێ.

بەڵام ئەوەش هەیە کە بۆ ڕزگار بوون لە شەڕانییەکان و دامەزراندنی هەرێمێکی سەقامگیری ئاشتی، پێویست بە بەهێزیی دەکات. شاعیر چەند جوان وتوویەتی:

**ئەگەر بتەوێ ئاشتی و تەبایی**
**ئەبێ حازر بی بۆ جەنگ و جیایی**

ئەوە گرنگە، ئەوەی کە لەسەر هەقە و بەتواناتریشە، داوای ئاشتی بکات. گەورەیی ئەوەیە لە کاتی سەرکەوتندا داوای ئاشتی بکەیت و لەکاتێکیشدا خەریك بێ ببەزیت، شەڕ نەکەیت. ئەرێ هیچ

شتێك هەیە لەوە زیاتر خزمەت بە ئاشتی بكات كە لە كاتی سەركەوتندا لێبووردە بێت؟ لەم ڕوانگەیەوە بەرزیی ئەو پێغەمبەرەمان (دروودی خودای لێبێت) كە لە دوای فەتحی مەككە، لە سەرسەختترین دوژمنەكانی خۆش بوو، بێنموونە و بێهاوتایە. بۆیە موسوڵمانێك شوێنكەوتەی ئەو بێ ئەوی بۆ خۆی كردبێت بە نموونە، دەبێ هەمیشە "گیانبازیی خۆشەویستی بێ و بۆ دوژمنایەتیی كاتی دەست نەكەوێ..."

موسوڵمان دوژمنایەتی هەستی دژایەتی دەكات، خۆشەویستیی بۆ خۆشەویستیی دەنوێنێ و دۆستایەتیی دۆستایەتیی دەكات.

با لەگەڵ (یوونس ئەمرە)دا بێژین:

ناومان مسكێنە ئێمە
دوژمنمان قینە، ئێمە

ئێمە ڕق لە كەس ناگرین
هەموان یەكن لای ئێمە

وەك (مالیكی كوڕی دینار)یش دەڵێ: ئەو بەرەنگاری و شەڕ و شۆڕەی دڵان ڕەق دەكەن و قین بەئاگا دێنن، لای موسوڵمان شتانێكی ڕەگ داكوتاو نین. موسوڵمان ئەوەیە كە: "ئەوانەی دێن بۆ كوشتنی، لای ئەم دەژیێنەوە...". ئەو شنەبای ئاشتییەی لە دونیای

پـڕ لـه خۆشەویسـتیی ئـەودا هەڵـدەکات، چـی دوژمنایـەتیی هەیـە ڕایدەماڵێت. چونکه موسوڵمان خاوەن تێڕوانینێکـی وایـە کـە دەم بـە خەنـدە بـوون خێـر و سـەدەقەیە. بـا بـە فەرموودەیـەکی پـیرۆز کـە هەرێمی ئاشتی لە ناخماندا دادەمەزرێنێت، کۆتا بەم باسەمان بێنین:

**«ناچنە بەهەشتەوە تا باوەڕ نەهێنن. باوەڕی تەواویش ناهێنن تا یەکترتان خۆش نەوێت. ئەریٚ شتێکتان فێر بکەم کە ئەگەر بیکەن یەکترتان خۆش بوێت؟ لەنێو خۆتاندا سەلام ببەخشنەوە.»**

ئەگـەر ئـەوە لەبـەر چـاو بگـیریٚ کـە یـەکێك لـە ماناکـانی سـەلام ئاشتییە، ئەو کات دەتوانین بڵێین ئاشتی خووی باوەڕدارە.



حەوتەم مانگی کۆچی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێت) هێزێکی سەربازیی ۳۰۰ کەسیی بە فەرمانداریێتیی حەزرەتی حەمزەی مامی، بۆ گەڕان و پشکنین دەرچوواندبوو.





کاروانێکی بازرگانیی مەککە کە ئەبوو جەهلیشیان لەنێودا بوو، لە کەنار دەریایەیەك بە ناوی (سەیفولبەحر) کەوتنە بەرانبەر سوپاکەی حەزرەتی حەمزە. ئیتر دۆخێکی وا هاتبووە ئاراوە، کە خۆ لادان لە بەیەکدادان وەك مەحاڵ وا بوو.

سەیفولبەحر کەوتبووە نێو زەویی خێڵی (بەنوو جونەین). (مەجدی کوڕی عەمر) کە سەرۆکی ئەو خێڵە بوو، دۆستی هەم پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێت) و هەمیش مەککەییەکان بوو.

مەجدی هەر کە خەبەرەکەی پێگەیشت، خۆی گەیاندێ. چاوی بە هەر دوولا کەوت و لە شەڕ پاشگەزی کردنەوە. بەم جۆرە کاروانەکە — کە ئەبوو جەهل سەرگەورەی بوو — بەرەو مەککە و یەکە سەربازییەکەی حەزرەتی حەمزەش بەرەو مەدینە گەڕایەوە.

کە ئەو هەوڵ و کۆششانەی مەجدی لە پێناوی ئاشتیدا دای بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) گێڕرایەوە، زۆری کەیف پێهات و فەرمووی:

— کارێکی ئەوەندە باشی کردووە، هەر هی دەستخۆشی لێکردنە.

پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) لە ڕێی ئەم فەرموودەیەوە گوزارشت لە بەهای ئاشتیی و تەبایی دەکات، هەر وەك ئەو دەرسەشمان فێر دەکات کە کاری باش ئەگەر لەلایەن کەسی ناموسوڵمانیشەوە بکرێ، هەر هی ئەوەیە بەڕێزەوە پێشوازیی لێبکرێت.



# خودا تاك و تەنهایە

## یەكتاپەرستیی بنچینەی باوەڕمانە

بنچینەی باوەڕمان، یەكتاپەرستییە. واتە باوەڕبوونێكی تـەواو بـە یەكیـەتیی خـودا. هـەر بۆیـە دەروازەی چـوونە نێـو ئاینەكەمانـەوە، وشەی یەكتاپەرستییە، واتە وتنی ڕستەی (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهَ – جگـە لـە ئەڵلا ، خودایـەكی تـر نییـە) بـە یـەقینێكی تـەواوەوە. سـەرەكیترین بنـــەمای كتێبـــە پیرۆزەكـــەشمان كـــە قورئـــانی پـــیرۆزە، هـــەر یەكتاپەرستییە. قورئانی پیرۆز چیی باس كردبێت، لـە هەنگـەوە بـۆ جاڵجاڵۆكە، لە درەختـەوە بـۆ خـۆر، كردوونـی بـە بەڵگـە بـۆ بـوون و یەكتایی خودای گەورە.

کورتترین ڕێی زانینی هەبوون و یەکتایی خودا، قورئانە. وەلێ ئەو کلیلەی ئەم ڕاستییە ڕوون دەکاتەوە، گشت بوونەوەرە گیاندار و بێگیانەکانە. گشت بوونەوەرێك، وەك هێماکانی هاتوچۆ لە قەراغ ڕێگەکان داچەقێنراون. وەك چۆن هێماکانی هاتوچۆ بۆ دەستەبەر کردنی گەیشتنی ڕێبوارانن بۆ شوێنی مەبەستیان، ئاوا ئەم جیهانی بوونەش، بۆ ئەوەیە مرۆڤ بگەیەننە خودای گەورە.

ڕێبوارێکی ژیر لەو هێمایانە عاسی نابێت. بەڵکو لە ماناکەی دەگات و ڕوو دەکاتە ئەو ئاڕاستەیەی دەیەوێ بۆی بچێت. چی بوونەوەر و بوویەری سروشتیی هەیە، مرۆڤ وەك هێمایەك ئاڕاستە دەکەن بۆ ئەو خودایەی لەو دیو و لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە...

ئێ خۆ هەر چییەك ئێمە دەیبینین، بۆ ئەوە لە لایەن خوداوە خولقێنراون تا بوون و یەکتایی ئەومان بۆ دەربکەوێت. بەڵام ئەوانەی بوونەوەران وەك نەخش و نیگارێکی خاڵی لە مانا دەبینن، ناتوانن لەم ڕاستییە بگەن.

نابێ بەدیار جوانیی بێهاوتای بەدیهێنراوەکان دۆش دابمێنین، بەڵکو دەبێ بتوانین ئەوان وەك نامەیەك کە خودا بۆ ئێمەومانانی نووسیوە بخوێنینەوە. بەم شێوەیە جیهانی بوون لەوە دەردەچێ تەنێ نەخش و نیگارێك بێ بەڵکو وەردەچەرخێ بۆ نووسینێك کە مانای قووڵ لە خۆ بگرێ و بەهای هونەریی بەرز بێت. ئەو ڕاستییە بنچینەییەی ئەم نووسینە پیشانی دەدات، بوون و یەکیەتیی خودایە.

مرۆڤایەتیی لە بابەتی باوەڕدا دەورانێکی فرە سەرەتایی و ساویلکانە ژیاوە. لە پێوەرە ئەقڵی و مەنتیقییەکان دەرچووە و وای بۆ چووە خودا دوان یان زیاترە. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا کەسانێك هەر ماون درێژە بەم هەڵەیە دەدەن. ئەمە لە کاتێکدا کە ئیسلامەتی **ئەوە هەزار و چوار سەد ساڵە هەوڵ دەدا مرۆڤایەتیی لە هەڵەی باوەڕ بە چەند خودایی ڕزگار بکات.** ئێ خۆ بوونی دوو خودا یان زیاتر، لە ڕوانگەی ئەقڵ و زانستیشەوە نامومکینە. لەبەر نامومکینیشی **ناتوانرێ بێتە سەلماندن.** وێڕای ئەوەی ئەوە هەزاران ساڵە بانگەشەی بۆ دەکرێت، بەڵام تا ئێستا بەڵگەیەکی جددی نییە بتوانێ وا لە مرۆڤ بکات باوەڕ بە زیاد لە خودایەك بهێنێ. لە بەرانبەریشدا، هەزاران بەڵگە هەن دەیسەلمێنن خودا تاك و تەنهایە.

ئێمە لێرەدا، سەرەتا ئەو ڕاستییە دەسەلمێنین کە ناکرێ دوو بەدیهێنەر هەبێ، چونکە ئەگەر ڕێی تێنەچێ بەدیهێنەر دوان بێ ئەوە ڕێی هەر تێناچێ سێ و پێنج و دە و بیست و زیاتر بێ.

**١- باوەڕ بوون بە دوو خودا، لە لایەنی مەنتیقییەوە شتێکی بێ مانایە،** چونکە ئەگەر سیفەتەکانی ئەو دوو خودایە چوونیەك بن، واتە سیفەتەکانی وەك هێز، توانا، خولقێنەری، زانست، لە هەر دووکیاندا وەك یەك بێ، ئەوە ئەوکات یەکیەتییەکی تەواو لە نێوانیاندا هەیە. هەر بۆیە بیرکردنەوە لە بوونی دوانێك کە یەك جۆرە سیفەتی وەك یەکیان هەیە و یەکسانن، هەڵەیە. بۆچوونێکی ئاوا دەربارەی

دوانەیی، لە تەواو تێنەگەیشتن یان نەتوانینی تێگەیشتنەوە سەرچاوە دەگرێ. چونکە ئەگەر دوو خودا هەبووایە کە خودان هەمان توانا و زانست و بەدیهێنەریی بوونایە، گشت ئەو هاوسەنگی و نیزامەی لە گەردووندا دەیبینین، تێك دەچوون.



بوونی دوو بەدیهێنەر، وەرچەرخانی ڕێکوپێکی بۆ پەرپووتی، سازان بۆ نەسازان دەگەیەنێت. بەڵێ، گەورەترین بەڵگە بۆ یەکیەتیی خودای گەورە، خولقێنرانی گەردوونە بە ڕێکوپێکی و ئیدارەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەرەوە. ئەم ڕێکخستنە کامڵ و ڕێکوپێکە کە ئەقڵ لێی ناگات، لە هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە درێژەی هەیە. ئەوەش براوەتەوە کە تا ڕۆژی قیامەتیش درێژەی دەبێت. ئەم نیزامە بێ نموونەیەی کە هیچ شێوان و گۆڕانێك ڕووی تێناکات، بوونی خودایەکی تاقانە پیشان دەدات کە بە وردترین حیسابات خولقاندوویەتی. ئەگەر جگە لە ئەڵڵا، خودایەکی دیکە هەبووایە، ئەم ڕێکییە سەراسیمەیە دەشێوا و تێکوپێك دەچوو. چونکە هەر خودایە و بەگوێرەی بۆچوون و ئیختیاری خۆی، نیزامگەلی تری دەهێنایە ئاراوە. بەم جۆرەش زەوی

و ئاسمان دەچوون بەیەکدا و ڕێکیی شەو و ڕۆژگار و وەرزەکانی ساڵ سەرەوخوار دەبوو و جووڵە و فەرمانەکانی هەیڤ و هەتاو و ئەستێرەکان ژێروژوور دەبوون. لەنێو ئەو گەرەلاوژەیەی بەهۆی ئەم تێکچوونانەوە دەکەوتەوە ژیان ڕادەوەستا. پەروەردگاری مەزنمان لە ئایەتی ٢٢ی سوورەتی (ئەنبیا)دا ئەم ڕاستییەمان بەم جۆرە بۆ ڕوون دەکاتەوە: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللَّهُ لَفَسَدَتَا﴾

**واتە: «ئەگەر (لە زەوی و ئاسمانەکاندا) خودایەکی تر جگە لە ئەڵڵا هەبووایە، ئەوە (نیزامی زەوی و ئاسمانەکان) دەشێوا».**

بەڕاستی ئەگەر دوو خودا هەبوایە، بۆی هەبوو لە هەمان کاتدا یەکێکیان شتێکی ویستبا و ئەوی دی نەیویستبا، بۆ نموونە: دوور نەبوو یەکێکیان بیویستایە سپێدە خۆر کازێر هەشت هەڵبێ و ئەوی دیکە نەیویستایە. لەم حاڵەشدا مەحاڵ بوو ویستی هەردووکیان لە هەمان کاتدا بێتە جێ. ئاواش بوایە، پشێوی و بێ سەروبەریی جێی بە ڕێککاریی چۆڵ دەکرد. خۆ ئەگەر بشوترێ یەکێك لەم دوانە داوای شتێکی نەدەکرد لەگەڵ هی ئەوی تردا دژ بوەستێتەوە، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی نوقسانیی هێزی ئیرادە و کەمی توانای بەدیهێنەریی دەربکەوێ، چونکە ئەوەی خودا بێ، دەبێ ئیرادە و دەسەڵات و بەدیهێنەریی سنووردار نەبێ، بەڵکو بێ کۆتا بێ. کەواتە بەپێی ئەو ڕێکخستنە بێکەموکوڕییە بەردەوامەی گەردوون کە ئێمەی تووشی

سەرسوڕمان کردووە، ئەوا دوو خـودا نییـە کـە ئـیرادە و ویسـتیان دژ بەیەك بوەستێتەوە.

٢- ئەگـەر واش دابنـرێ کـە یـەکێك لـەو دوو خودایـە بـاڵاترە، ئـەوە دیسان بابەتەکە یەکیەتییە نەك دوانەیی. چونکە ئەوەیان کە لاوازترە ئاتاجی بە بەهێزترەکە دەبێت و ژێر دەکەوێ. ئـەوەش کـە موحتـاج دەبێ، دەکرێ بەدیهێنەر نەبێ بەڵکو بەدیهێنراو بێ. ئەم ڕاسـتییە لـە ئایـەتی ٩١ی سـوورەی (ئـەلموئمینوون)دا بـەم جـۆرە گوزارشـتی لێکراوە: ﴿ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ وَلَدٍ وَ مَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذًا لَذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَ لَعَلاَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾

واتە: «خودا منداڵی بۆ خۆی ڕانەگرتووە و هیچ خودایەکی تریشی لەگەڵدا نەبووە و نابێ. (ئەگەر هەبوایە، ئەوە) هەر خودایە و ئەوەی خـۆی بـەدیهێناوە گـیرا دەکـرد (و دەپاراسـت) و بەدڵنیاییشـەوە یەکێکیان بەسەر ئەوی دیدا زاڵ دەبوو».

٣- ئەگـەر واش دابنـرێ کـە ئـەو دوو خودایـەی بانگەشـەی بوونیـان دەکرێ، هەر یەکەیان خاوەن سـیفەتگەلێکی جیایـە لـەوی دی، ئـەوە لەم بارەشدا، ئەنجامەکە هەر یەکیەتی دەبوو. چونکە ئەو سیفەتانەی کە هەر یەکـەیان جیـا لـەوی دی هـەیبوو، لێکـی جـودا دەکردنـەوە و یەکسـانی و یەکیەتییەکـەی نێوانیـان دەشـێوا. کـە یەکسـانییش لـە نێواندا نەما، بەگژ یەکداچوونەوە و ململانـێ لـەنێوان هـەردوو لا دێتـە

ئاراوه. بەم جۆرەش، باڵادەستەکە ئەوی دیکەی لەناو دەبرد و بەتەنیٚ دەمایەوە.

٤- ئەڵڵا بوونێکی موتڵەقە. کە موتڵەقیش بیٚ، ئەوا بیٚ کەموکوڕیی و نوقسانییە. لە گشت سیفەتێکیدا تەواوە و خاوەن کەماڵێکی قەتعییە. ئەگەر وا نەبیٚ، ناتوانیٚ ببیٚ بە بەدیهێنەر. ئێستا با بیربکەینەوە، ئایا دوو بوونی موتڵەق دەشیٚ ببیٚ؟

- نەخێر، نابیٚ.

- بۆ نابیٚ؟

- چونکە بوونی موتڵەق لە هەر کامێکیاندا بیٚ، ئەوی دیکە بوونی نامێنیٚ. واتە ئەوەی کە کامڵترینە، ڕێگەی ئەوەی تر نادات خودایەتیی لێبوەشێتەوە. چونکە ئەوەی بەدیهێنەری ڕاستینە بیٚ، لە سەڵتەنەت و حکومڕانییدا هاوبەش قبووڵ ناکا. چی لە دەرەوەی خۆی هەیە دەیخاتە ژێر ڕکێفی باڵادەستیی و فەرمانڕەوایی قەتعیی خۆیەوە. بۆیە ئەو بەدیهێنەرە قەتعی و موتڵەقە، هەر چییەك هەیە دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆی. لەمەشەوە تێدەگەین هاوبەش و ڕەقیب و هاوشێوە و هاوتای نییە و نابیٚ. ئەوەی بەدیهێنەر بیٚ ناچێتە ژێر حکومڕانیی غەیری خۆیەوە، واتە بەدیهێنەر نییە. هەر بۆیە، خودا هەر دەبیٚ یەك بیٚ، مومکین نییە دوو، سیٚ، پێنج وە یان زیاتر بیٚ. خودا، ئەو تاکە بەدیهێنەرەیە، کە تەواوێك دوورە لە هەموو سیفەتێکی ناشیرین و کەموکوڕییەك.

٥- «یەکیەتی» تەنها لەوەوەیە کە یەکە. واتە ئەو یەکێتییەی لەنێوان ڕەگەزەکانی ئەم گەردوونەدا دەیبینین، لە لایەن یەکێکەوە فەراهەم هێنراوە. بۆ نموونە: یەکیەتیی ڕووەکەکان لە نێوان خۆیاندا... ئەوەی کە دار ئەسپیندار لە هەموو شوێنێکی ئەم دونیایەدا هەر وەك یەکن... گوڵەباخ و گژوگیاکان... ئەوەی کە ئەو سەدان هەزار ڕووەکە لە هەموو شوێنێکدا هەر هەمان شکڵ و شێوەن و لە بونیادیاندا یەکێتییەك هەیە، ئەوە دەردەخات کە ئەوان تەنها و تەنها بەرهەم و دەستکردی تاقانەیەکن. لە جیهانی ئاژەڵانیشدا یەکیەتییەك هەیە کە ناتوانرێ نکوولّیی لێبکرێ. کەواتە ئەوانیش هەر لە تاقانەیەکەوەن. مرۆڤایەتیش بە ئەندامە ناوەکی و دەرەکییەکانییەوە یەکیەتییەك دەنوێنن. هەر بۆیە ئەوانیش بەرهەم و بەدیهێنراوی تاقانەیەکن. کورتییەکەی، یەکیەتیی بوونەوەران، ئەوە پیشان دەدات کە لە لایەن یەکێکەوە حاسڵ بوون. ئەوەی کە ناشێ جێدەستی دوو خودا یان زیاتر بن، کە سەرچاوەی لێك تێنەگەیشتن و پشێوین، تا بڵێی ڕوون و ئاشکرایە.

وێڕای ئەوەش، وەك چۆن لەنێو گشت ڕەگەزی بوونەوەرێکدا یەکیەتییەك هەیە، ئاواش لەنێوان ڕەگەزە جیاجیاکاندا تەبایی و پێکەوە گونجان و نیزام هەیە. شەڕ و دووبەرەکی و لێك تێنەگەیشتن لە نێوانیاندا نییە. بەڵکو ڕێك بەپێچەوانەوە، جیهانی بوون لەنێو لێك تێگەیشتن و پێکەوە سازان و هەماهەنگییەکی تەواودایە. ئەمەش

ئەوە پیشان دەدات کە ئەوان ئەو نیزامەیان لە تاکە خودایەك نەك فرەیەك خوداوە بۆ دێت... بۆ نموونە: ئەوەی کە باران بۆ هانای ڕووەك، ڕووەك بۆ سوودی ئاژەڵ، ئاژەڵیش بۆ کەڵکی مرۆڤایەتیی هەڵپەیەتی، ئەوە پیشان دەدات کە هەر هەموویان لە یەك شوێنەوە فەرمان وەردەگرن.

گەردوون هاوسەنگییەکی سەراسیمەی وای هەیە بەندە بە حیساباتی زۆر وردەوە. وا دانانی ئەوەی کە ئەم هاوسەنگییە سەراسیمەیە لە هۆکارە بێگیان و بێفام و بێهەست و نابیست و نابیناکانەوە، یان لە ڕێککەوتەوە یانیش لە سروشتەوەیە، گەلێك لە ئەقڵەوە دوورە.



کەسانێکی دی بانگەشەیەکی زۆر گەمژانەتر دەکەن و دەڵێن: "هەر شتە و خۆی خۆی بەدیدێنێ". ئەگەر ئەوە وا بێ، ئەوە مرۆڤ ناچار دەبێ باوەڕ بە خوداگەلێکی ئەوەندە زۆر بێنێ کە لە ژماردن نەیەن. ئەوە بێ ئەقڵییە پێمان وا بێ لە گەرد و گەردیلە و خانەکاندا، لە ئەلیکترۆن و نیوترۆنەکاندا بەدیهێنەریی هەیە. ڕاکردنە لەدەست ئاسانیی باوەڕهێنان بە تاکە بەدیهێنەرێك و خۆ دانە دەست ناموکینیی هەبوونی خوداگەلێکی بێشومارەوە.

لـه نێـوان ڕووەك و ئـاژەڵ و مرۆڤەكانـدا پەیوەنـدی و سـازانێكی مەزن هەیە. سازان و پێك چوونی دونیای ڕووەكان لە لایەك... ئەوەی لە بەرزترین ئاستدایە لـەنێو ڕووەكەكانـدا، پەیوەنـدیی هەیـە لەگـەڵ ئەوەی لەنێو دونیای ئاژەڵاندا خاوەن كەمترین توانایـە. پێشـكەوتن و پێگەیشتن و توانا و شێوازەكانی هەڵسوكەوتی ئاژەڵان، زۆرێك لە هـی مرۆڤەكان دەچێت. ئەم یەكیـەتی و بەیـەك چوونانەش هێمـا بـۆ ئـەو خودایە دەكەن كە گەر چی ئەوانی لەسەر ڕەگەز و شێوەی جیـا جیـا بەدیهێناوە، بەڵام یەكیەتی و سازانیشی لەنێوانیان فەراهەم هێناوە.

بەڵێ بێگومان هەر دەبێ یەكێك هـەبێ، لـەم گەردوونـەدا هـەموو شتێكی لە یەك شت و یەك شتیشی لە هەموو شتێك بەدیهێنابێ.



## "بە منداڵەکەتت وتووە قورئان بخوێنێت؟"



لە چەند شوێنێکی جیادا وتوومە، لای ئێمە ڕەخنە گرتن لە دین، وەك بڵێی ئەرکی سەر شانمانە! لە زۆر بواردا ئەم ڕێیە دەگرینەبەر. براکەم، خوشکەکەم! ئەگەر لەسەر تەلەفزیۆن و لە زنجیرە درامای «ماڵە بچووکەکە»دا پیاوەکە لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەیدا و لەسەر خواردن، ئەگەر لە بەرانبەر نیعمەتی ئەو خواردنانەی خودا پێی بەخشیون، دەست بەرز بکەنەوە و شوکری خودا بکەن، دواکەوتوویە؟ ئەمە دواکەوتوویی نییە. با چەند نموونەیەکتان بۆ بێنمەوە:

بەم دواییانە (کارتەر-ی سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا-وەرگێڕ) داوەتی کردم. لە ڕێوڕەسمێکی ئیفتیتاحدا بەشداریمان کرد. ئێوارەکەی خوانێکی ٣ هەزار کەسی پێشکەش کرا. بۆ بەیانییەکەی ١٥٠ کەسێك هەڵبژێردرا بۆ قاوەڵتی. منیش لەنێو ئەو ژمارەیەدا بووم. هەشت-هەشت، دە-دە لەسەر مێز دایان نیشاندین. ئەو کەسە ناودارانەی لە چەندین شوێنی دونیاوە هاتبوون، تەعاروفیان لەگەڵ یەکدا کرد. هەمووی لە لایەکەوە خەریکی قسە و لە لایەکیشەوە لە چاوەڕوانیدا بوون. کەس دەستی بۆ خواردن نەدەبرد. پاشی مارەیەك قەشەیەك هات. هەموان هەڵسانە سەر پێ و دوگمەی چاکەتەکانیان داخست. قەشە نزای شوکرانەی کرد، ئینجا دەست کرا بە خواردن. جارێکی تریش هەر لە ئەمەریکا بووم و بڕیار بوو لە ویلایەتی تەکساس نەشتەرگەرییەکی دڵم بۆ بکرێت. بڕیاری نەشتەرگەرییەکەم بۆ درابوو. قەشەیەك بەژوور کەوت، وتی: "لە پەروەندەکەتدا بەرچاوم کەوت کە موسڵمانیت. ئەگەر هەستیارییەکت نەبێ، من پیاوێکی ئاینییم. خودا هەر یەکە. دەمەوێ بەر لەوەی بچیتە ژێر نەشتەرگەریی، دوعات بۆ

بکەم. قبووڵتە؟"

وتم "ئەی بۆ نا؟!". لە بەرانبەر ئەم ڕووداوەدا زۆر دڵخۆش بووم، دیدەکانم ئەسرینیان تێزا. لە کاتێکدا نەشتەرگەرییەکی وا گەورەم بۆ بکرێ، قەشەیەك لەوێ بێت و لێم بپرسێ داخۆ دەمەوێ یارمەتیم بدا؟... پێم وت منیش هاوڕام لەگەڵت و سوپاسم کرد.

ڕووداوێکی تری هاوشێوەی ئەمانەم لە شوێنێکی دیکەشدا گێڕاومەتەوە. کچەکەم بردە قوتابخانەی نموونەیی هارفارد کە لە نزیك شاری لەندەنە. ئەو کات بۆم کەوتنە تاریف کردن: ئەوێ خواردنگەیە، شوێنی نوستن ئێرەیە، شوێنی سەعی کردن ئەمەیە، کتێبخانەش ئەوەتا... یەکە بە یەکەی بەشەکانی قوتابخانەکەیان پیشاندام. پاشان کڵێساکەیان پیشاندام و وتیان ئەمەش شوێنی پەرستشە. پاشانیش پێیان گوتم: "کیژی تۆ موسوڵمانە. لە ڕۆژانی عیبادەتدا با قورئانێك بێنێ و هەر ڕۆژێك دەیەوێ با بیخوێنێ". لێیان پرسیم: "تۆ پێت وتووە لە ژوورەکەی خۆیدا بمێنێتەوە و قورئان بخوێنێ؟". خوا هەیە و دەمانبینێ، ئەوەی ڕاستی بێت لەگەڵ کچەکەمدا قورئانی پیرۆزم نەهاوردبوو، پێشم نەوتبوو بیخوێنێ. شەرم دایگرتم و زۆر بەسەر خۆمدا شکامەوە. لەو دەرسەی ئەو کابرایەی ئێمە گاوری پێدەڵێین فێری کردم، زۆر هەستم بە خەجاڵەتباری کرد. وەك زللەیەك بوو درابێت لە دەموچاوم. هەر کە گەڕامەوە تورکیا، دەمودەست نوسخەیەك قورئانم بۆی نارد کە ڕاڤەشی لەگەڵدا بوو.

ئەمانەم بە چاوی خۆم بینیوە.

ساکیپ سەبانجی

(گەورە ملیاردێری بە ڕەگەز تورکی جیهان-وەرگێڕ)



# ئایا توانیومانە کاتەکانمان باش بنرخێنین؟

**خۆرئاواییەکان لە موسڵمانانەوە فێری**

**باش بەکارهێنانی کات بوون...**

لە خولێکی فێربوونی زمانی ئەڵمانیدا بووم. مامۆستاکەمان کەسێکی زۆر جددی بوو. بەتایبەت لە مەسەلەی کاتدا، هیچ لێبووردەیی نەبوو. هەموو هەفتەیەک، هەر کەسەو چەندێک لە وانەکاندا دوا بکەوتایە، هەمووی بۆ کۆ دەکردەوە و ئەوەندە لە پۆلدا دەیهێشتەوە. بێگومان ئەم بارودۆخە، بەدڵی ئەو خاوەن کارانە نەبوو کە بە چ حاڵێک ئەوەندە کاتەیان بۆ ئەو خولە تەرخان دەکرد. ڕۆژێک هاوڕێیەکمان کە سزای ئەو هەفتەیەی گەیشتبووە ١٨ خولەک، تووڕە بوو و وتی:

– بەس ماوە چرکەکانیش حسێب بکەیت! قەی ناکا، جارێکی تـر ۲۰ خولەکیش لە پۆلدا دەمێنمـەوە، بـەڵام ئێسـتا کـارێکی زۆر گـرنگم هەیە...

ئەڵمانییە بەتەمەنەکە، بەچاو ترووکانەوە ماوەیەك لەم هەڤاڵە ڕاما و وتی:

– نەخێر، نابێ، چونکە ئەگەر ئێوە ئەوەنـدە گرنگیتـان بـە کـارە گرنگـەکانتان بدایـە، ئێسـتا تـۆ ئـەم سـزا ۱۸ خولەکییـەت لـە مـن وەرنـەدەگرت. خـۆ دەرسـیش بـۆ ئێـوە کـارێکی گرنگـی بـە دەم و وەختە. هەر بۆیە، هەر ئێستا لە پۆلدا دەمێنیتەوە و منیش وانەیەکی ۱۸ خولەکیتان پێدەڵێمەوە.

بێگومان مامۆستاکەش تووڕە بووبوو. منیش بەمەراقەوە لە پۆلـدا مامەوە.

دوای ئەوەی چەند خـولێکی بـەنێو ڕەحلەکانـدا خـوارد، مامۆسـتا وتـی:

– هەڤاڵێنـە! کاتـەکانتان بـاش نـانرخێنن. بگـرە لـە ئاسـت ئـەو هەستیارییەی من لەو بارەیەوە هەمە تووڕەش دەبـن، بـەڵام مـن پـێم وایە لەسەر هەقم. ڕەنگە لـەنێو خۆشـتاندا بڵێن ئەمـە چییە مێشـك گاور؟!

چووەوە سەر مێزەکەی. خشتەیەکی چاپکراوی دەرهێنا، وتی:

– تکایە سەیرێکی ئەمە بکەن.

خشتەی کاتی شەمەندەفەر بوو. هاوڕێکەمان خەریك بوو هەر بە لاچاوێك لێی بڕوانێ و بۆی بگێڕێتەوە، بەڵام ئەو وتی: "نا، من دەمەوێ باشتر لێی ورد ببیتەوە." کاتی کەوتنە ڕێ و گەیشتنە جێی شەمەندەفەرەکانی پێخوێندەوە. هەموویان ژمارەی جیا جیا و ئاڵۆز بوون. بۆ نموونە کاتەکانی کەوتنە ڕێ ٦:١٨ و ٩:٣٥ خولەکی ئێوارە بوون. کاتەکانی گەیشتنیش هەر وا بوون، وەك ١٢:٤٦ و ٩:٢٧ خولەك...

ئەو هەڤاڵەمان کە سزا هەژدە خولەکییەکەی وەرگرتبوو، کە ئەو ژمارانەی بینی، بە مامۆستاکەی وت:

– سەیر بکە، ناماقووڵیی مێشکی ئەورووپی ئا لەمەدا بەڕوونی دەردەکەوێت. چ مانای هەیە ئەم ئەوەندە و ١٢ خولەك، ٣٦ خولەك... لەباتی ئەوە بتانوتایە سێ و نیو، چوار و نیو نەدەبوو؟ هەر هیچ نەبێ بتانوتایە ئەوەندە و چارەك، تا ژمارە و کاژێرێك بێ، لە بیری خەڵکی بمێنێتەوە...

ئەڵمانییە بەساڵداچووەکە، خەندەی بەلێودا هات. بە ڕوانینەکانیدا دیار بوو، ئەوەی دەیویست بیڵێ پێی گەیشتبوو.

– بڕوانە، سووکایەتی بە خۆتان مەکە، چونکە ئەوەی بووەتە هۆی دانانی ئەم خشتەی کاتە، «ناماقووڵیی مێشکی ئەورووپی» نییە، بەڵکو «ماقووڵیی مێشکی موسوڵمانان»ە. چونکە ئێمە لە

موسوڵمانانەوە فێری بەکارهێنان و نرخاندنی کات بووینە. ئا ئەم خشتەی شەمەندەفەرەش نموونەیەکی جوانی ئەم تێگەیشتنەیە.

لەو کاتەدا کە ئێمە بە سەرسوڕمانەوە لێیمان دەڕوانی، مامۆستاکە وتی:



– لە پەرستشەکانی ئێوەی موسڵماندا، شوێن گرنگ نییە. لە هەر شوێنێکی ئەم دونیایەدا دەکرێ پەرستش بکرێ، بەڵام کات زۆر گرنگە. چونکە گشت پەرستشەکان کاتێکی تایبەت بە خۆیان هەیە. بگرە ئەو کاتە، لە مەرجەکانی ئەو پەرستشەیە. بەو واتایەی پەرستشێك لە کاتی خۆیدا نەکرێ بە کراو دانانرێ. کاتی نوێژەکانیش وەك کاتی شەمەندەفەرەکانی ئێمە هەر وان: ئەوەندە و ١٨، ١٧، ١٣، ١٠، ٩ خولەکن. ئەمە وێڕای ئەوەی ئەو کاتانە، بەردەوامیش لە گۆڕاندان. ئەمڕۆ تا ٧:٢١ دەقە دەتوانی نوێژی بەیانی بکەیت، بەڵام سبەینێ تا ٧:٢٢ دەقەش دەتوانی بیکەیت، بەڵام لە ٢٣ دەقەدا ناتوانی بیکەیت. ئەوەی وایە تەنها نوێژ نییە، کاتەکانی دەست پێکردن و کۆتاهێنان بە ڕۆژووش هەر وان. ئەو

کاتانەی ئاوا وابەستن بە حیساباتی وردەوە، ڕۆژانەش گۆڕانیان بەسەردا دێت.

بەم جۆرە موسوڵمانان لە بەرانبەر ئەو کاتەی هەموو ڕۆژێك گۆڕانی بەسەردا دیٚ، چاو کراوە و وریایە و نرخی دەزانێت و بەردەوام لە ئامادەباشیدایە بۆ باش نرخاندنی. موسوڵمانێك پەرستشەکانی بەجیٚ بێنیٚ، ناچارە ئاگای لەو کاتانە بێت کە ڕۆژانە لە گۆڕاندان و دەقە بە دەقەی بنرخێنێت. سەرچاوەی ئیلهامی ئێمە لە تێڕوانینمان بۆ کات، موسوڵمانانن.

کە مامۆستا ئەڵمانییە بەساڵداچووەکە وتی: "ئێستا دەتوانن بڕۆن."، هەموومان هەستمان بە شەرمەزارییەکی وا دەکرد کە لە باس کردن نایەت.

***

## ڕێکخستنی پەرستشەکان لە ئیسلامدا، سەرنجی مرۆڤ لەسەر کات کۆ دەکاتەوە

هەر بەڕاستی شێوەی ڕێکخستنی پەرستش کە ئیسلام هێناویەتی، بانگهێشتی مرۆڤ دەکات بۆ بەهەند وەرگرتنی کات. ئەوەی کە کاتێك هاوەڵان لە یەکدی جودا دەبوونەوە سوورەی «عەسر»یان دەخوێند، گەلێك مانا لەخۆ دەگرێت. ئەم سوورەیە بەوە دەست پێدەکات کە خودای گەورە سوێند بە کات و سەدە و

چاخەکان دەخوات. بەم شێوەیە، بەهای پیرۆزی کات لە ڕێی قورئانی پیرۆزەوە تۆمار کراوە.

هەر پەرستشەو بەندە بە کاتێکەوە. نوێژ کە کاتی سووڕانی کاتەکانی ڕۆژ دیاری دەکات، ناکرێ لە وەختی خۆیدا نەبێ، بکرێ. گشت ڕۆژەکان بە بانگی ئیلاهیی پێنج دەمی پیرۆز دەبن... ڕۆژووش ناچارمان دەکات سەرنجی ڕەمەزان بدەین، کە ئەویش هەر لە ڕێی مانگەوە دیاری دەکرێ. زەکاتیش لەو قازانجە دەدرێ کە ساڵی بەسەردا تێپەڕیبێ. کاتی حەجیش، وەك گشت پەرستشەکانی تر، هەر بە وەرز دێت و دەچێت.

بەڵام ئەوەش هەیە، شاعیر وتەنی: "ئەوەی نوێژی نەبێ، بۆ هەموو کاتێك بیانووێکی ئەبێ".

***

## ئایا دەبێ بە تێپەڕینی کات دڵخۆش ببین؟

کات کە سەرمایەیەکی پیرۆزە، زۆر جار بە شێوەیەکی نابەرپرسانە خەرج دەکرێ، لە هیچدا بەفیڕۆ دەدرێ. هەق وایە ئەوانەی وا دەکەن، تاوتوێی مرۆییان بکرێ. گوتەزایەکی جوان هەیە دەڵێ: "کەسانی ساویلکە بیر لەوە دەکەنەوە چۆن کاتەکانیان بەسەر ببەن، بەڵام گەورەکان لەوەی چۆن بەکاریان بێنن...".

ئەوانەی بیر لەوە دەکەنەوە کە دەتوانرێ لەناو کاتدا چی بکرێ، بێگومان نایانەوێ کات تێپەڕ ببێ. ئینجا ئەوەی لە خۆشیی تێپەڕینی کات دڵخۆش دەبێ و هەڵدەبەزێتەوە، ئەوە هەر هیچ. کەوا بوو ئیتر ئەو ئاهەنگ و ڕابواردنانەی سەری ساڵ چ مانایەکیان هەیە؟



دەبێ لە ئاست تێپەڕینی کات و جارێکی دی نەهاتنەوەی، دڵخۆش بین یان دڵتەنگ؟ ئەوەی ڕاستی بێت ئێمە کات تێناپەڕێنین، بەڵکو ئەوە کاتە ئێمە تێدەپەڕێنێ. ئایا مومکینە هەست بەوە نەکەین کات وەك مشارێکی بێدەنگ لە کاردایە؟

***

ئەوەی ڕۆژ بە ڕۆژ پیر دەبێ و سات لە دوای سات کەمێکی تر لە مەرگ نزیك دەبێتەوە، ئێمەین نەك کات... خۆزگە بتوانرایە بە کات بوترێ: "بوەستە"... بریا بمانتوانیایە لە تونێلی ژیان بگەڕێینەوە دواوە و مومکین بوایە جارێکی تر بگەڕاینایەوە ژیان...

توانای ئەمەمان نییە، بەڵام توانای ئەوەمان پێدراوە بتوانین ئەو گەنجێتییەی لەم دونیایەدا بەدەستمانەوەیە، وەری بچەرخێنینە سەر

**گەنجێتیی ئەبەدیی لە ڕۆژی دواییدا.** ئەمە پڕ قـازانجترین بازرگانییـە کە خودای گەورە پێی ڕەوا بینیوین، چونکە چانسـی ئـەوەمان هەیـە بـە گەنجێتییـەکی فـانی و کـاتی، گەنجێتییـەکی ئەبـەدیی و پـڕ لـە کامەرانیی و ژیانێکی نەبڕاوە بەدەست بێنین.

پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لێبێت) دەفەرمووێت: **«ئـەوەی دوو ڕۆژی وەك یەك وا بێت، هەڵخەڵەتاوە».** هەڵخەڵەتاوەکانیش، واتە ئەوانەی کاتیان بەخراپ بەسەربردووە، لەوانەن کـە زۆرتـرین گلـەییان هەیە لە بێوەختی.

## جەردی کات

پێویستە مرۆڤ بە بیرێکـی سـاغ و گونجـاوەوە جـەردی کاتـەکانی بکات... واتە بەشێك لە کاتـەکانی بـۆ بیرکردنـەوە تـەرخان بکـات... ئەوەتا پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لێبێـت) دەفـەرمووێت: "**یـەك کاژێر بیرکردنـەوە، لـە شەسـت سـاڵ پەرستشـی نافیلـە (سـوننەت) خێرترە**".

***

**"... کاتم هەبوایە، کورتتر دەمنووسی..."**

بەڵێ، ئەوانەی بەر لە دەست دانە نووسـین، کـات بـۆ بیرکردنـەوە تەرخان دەکەن، دەتوانن کورتتر بنووسن... ئەوانـەی بـەر لـە کردنـی

شتێك بیردەكەنەوە، دەتوانن باشتر كارەكە ئەنجام بدەن و باشتر ببێكن... ئەوانەی بە بیركردنەوەوە دەژین، دەتوانن ژیانێكی پڕ خێرتر و بەرهەمدارتر بژین.



"ئێستا نا، ئەی كەی؟"، ئەوەی ئەم پرسیارە لە خۆی دەكات ڕاست دەكات، وا نییە؟ ئەوەش كە دەڵێ: "سبەی دەیكەم"، هەق وایە ئەوەی لەبیر بێت كە:

"ئەمڕۆ سبەینێی دوێنێیە. ئەمڕۆ چیت كردووە، سبەینێش هەر ئەوە دەكەیت؟"

"ئیتر بۆ من زۆر درەنگە"، ئەو قسەیەی كە دەبێ بەمانە بوترێ ئەوەیە كە: "بۆ هیچ شتێك درەنگ نییە".

ئەو پیاوەی دەڵێ: "بە كار كردن دەحەسێمەوە، بە حەسانەوەش كار دەكەم"، كەسێكە تێگەیشتووە لەوەی حەسانەوە بە هیچ نەكردن —واتە تەمەڵی— نایەتەجێ. مەگەر زانستیش هەر وا نالێ؟

# به چ هەقێك كاتم دەخۆیت؟

ڕۆژانە چەند كـاژێر كۆشـش دەكـەن؟ ئێـوە نـازانم، بـەڵام ئـەوەی دەربارەی ئەدیسۆن دەوترێ ئەمەیە:



لــە یــەكێك لــەو ڕۆژانــەی بــەدوای داهێنانێكدا بووە و ڕۆژی بیست سـەعات كاری كردووە، خەو زۆری بۆ هێناوە، بـە یاریدەدەرەكـەی وتـووە كـە دوای نیـو سەعات خەبەری بكاتەوە و، هەر لەسـەر ئـەو تەپڵەكـەی كـاری لەسـەر كـردووە خەوتووە. بەڵام دوای ئـەو نیـو كـاژێرە، یاریدەدەرەكەی دەبینێ ئەدیسۆن لـە خـەوێكی قـووڵ و شـیریندایە، دڵی نایەت هەڵیسێنێ... نیو كاژێرێكی تر چاوەڕێ دەكـات ئینجـا لـە خەو هەڵیدەسێنێ. ئەدیسۆن هەر كە چاوی دەكاتـەوە، یەكـەم كـاری ئەوە دەبێ لە كات بپرسێ. كە دەزانێ سەعات چەندە، زۆر بەتونـدی دادەبەزێتە سەر ئەو یاریدەدەرەی كە گەلێكیش خۆشی ویسـتووە، و پێی دەڵێ:

– بە چ هەقێك نیو كاژێر لە كاتم دەخۆی؟

بۆ چاوپێكەوتن چـوومە لای مێژوونووسـێكی بـەناوبانگی خۆمـان. پێنج خولەك بەر لـە كـاتی ژوانەكـەمان، لـە زەنگەكـەیانم دا. دەرگا

نەکرایەوە. جارێکی تر، جارێکی تر لێم دایەوە. بێ ئومێد بووم و خەریك بووم بگەڕێمەوە، ئەفەندییەکە لە بەلەکۆن بەدەرکەوت و وتی "کوڕی خۆم! بەتەنێ لە ماڵم، لەبەر ئەوەش کە لەم کاتەدا هیچ ژووانێکم نییە، بۆیە دەرگام نەکردەوە. قسوورم عەفو بکە، هەر ئێستا دێم"... بەم شێوەیە جارێکی دی بەناسکی و لەسەرخۆیی ئەوەی بۆ ڕوون کردمەوە کە دێرکەوتن و زوو بەدەرکەوتن، دوو ڕووی دراوێکن.

پێنج دەقەکان، ئاخ پێنج دەقەکان! چەندیان لە چیدا بەفیڕۆ دەدەین!..

## زەمانی تازەوە بوو، ئینسانی تازەوە بوو

یوونس ئەمرە دەڵێ: **"هەموو ڕۆژێك لەدایك دەبینەوە..."**. ئەرێ بەڕاست هەموو ڕۆژێك سەرلەنوێ لەدایك دەبینەوە؟ ئێمە مرۆڤگەلێکین، هەموو ڕۆژێك چاومان بە ڕووی ڕۆژێکی نوێدا دەکەینەوە. وەك چۆن حاڵی مەعنەویمان دەگۆڕێ، بونیادی مادديشمان گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەوەی کە ساڵی جارێك تەواوی خانەکانی جەستەمان تازە دەبنەوە، ئیتر ڕاستییەکی زانستییە.

ئەو کەسەی لەگەڵ تازەبوونەوەی کاتدا ئەویش تازە دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی هەمیشە لە گۆڕاندایە، بۆ ئەوەی هەمیشە لەسەر هەمان

ئاراستە بێت، دەبێ لەگەڵ بەدیهێنەرەکەیدا لە پەیوەندیی بەردەوامدا بێت. مرۆڤ بۆ ئەوەی ڕێ و ڕێبازی خۆی ون نەکات، دەبێ باوەڕ لە ناخیدا وەك ئەستێرەی قوتب بدرەوشێنێتەوە. بۆیە پێویستە باوەڕ بەردەوام تازە بکرێتەوە و یادی خوا بخرێتەوە. مەگەر هۆیەکی دووبارە کردنەوەی زیکر و پەرستشەکانیش هەر ئەمە نییە؟ ئایا هەق وا نییە لەگەڵ ئەو کاتەی هەمیشە لە گۆڕاندایە، بەردەوام بین لە جەخت کردنەوە لە پابەندیمان بە ئیمان و ئیسلامەوە؟

## کات لەگەڵ خۆتدا بگونجێنە

ئەوانەی دەڵێن: "چی بکەین زەمانە خراپە"، هەق وایە بەم وتەیە وەڵام بدرێنەوە:

"ئەی مرۆڤ! زەمانە تۆیت. تۆ باش بیت، زەمانەش باش دەبێت. خراپیش بیت، خراپ دەبێت".

باشە مرۆڤ چۆن چۆنی دەتوانێت بڕیار لەسەر زەمانێك بدات کە خۆی هێشتا لەناویدایە؟ بۆ مرۆڤ ئاسان نییە بتوانێ هەڵسەنگاندن بۆ زەمانێك بکات کە خۆی لەناویدا بژی. "کەسێك بیەوێت بەتەواوی سەردەمەکەی خۆی ببینێت، دەبێ لە دوورەوە لێی بڕوانێ"... بە گوزارشتێکی تر، لەسەریەتی پێشی زەمانە بکەوێت یانیش بەسەری بکەوێت. بەم جۆرە ئەوانەی لەناو ڕۆژدا ناژین، بەڵکو لەسەری یان لە

پێشییەوە دەژین، دەبن بەو کەسە مەزنانەی زەمان لەگەڵ خۆیانـدا دەگـونجێنن. خــۆ هــەر بەڕاســتیش گشــت شارســتانێتی و گشــت هەوڵەکانی پێشکەوتن، جێدەستی ئەم جۆرە کەسانەن.

## کات چۆن فراوان دەبێت؟

ئەو دەنگەی (ماهیر ئیز بێی)ی مامۆستام کە دەیـوت: "دەم ئـەم دەمەیە، دەم ئەم دەمەیە، دەم ئـەم دەمەیـە... نرخـی ئـەم دەمـە بزانە، بەوریایی بیژیێنەوە" هێشتا لە گوێچکەمدایە. بـەڵێ دەم ئـەم دەمەیـە (کـات ئـەم کاتەیـە)، سـات ئـەم سـاتەیە. چـونکە ڕابـردوو ڕابیوردووە و ڕۆیشتووە، ئایندەش جارێك نـەهاتووە. ئینجـا دیـاریش نییە دێ یان نا، بێتیش چۆن دێ. ئەوەی کە بە دەستمانەوەیە تـەنها ئـەم سـاتەیە کـە تیایـدا دەژیـن. واتـە ئێمـە نـە لـە ڕابـردوو و نـە لـە ئایندەدا دەژین، بەڵکو لە ئێسـتادا دەژیـن. تـەواوی پەیوەنـدیمان بـە ژیان و دونیاوە، بەهۆی ئەم کاتەوەیە کە لەناویدا دەژین.

زۆر جــاریش لــە ڕابــردوو تــەنها "ئــاخ" و "ئۆف"ەکـان مـاون و ئاینـدەش بـە تـرس و ڕاڕاییـەکان تـەنراون. مـرۆڤیش نایـەوێت لـەنێو تەنگەبەریی ئێستادا بمێنێتەوە، بـەڵکو لـە هـەوڵی ئەوەدایـە فراوانـی بکات، بە فراوان کردنیشی لە دەردەسەرییەکانی ڕزگاری ببێت.

ئەوەی ڕاستی بێت فراوان کردنی کات و ڕزگار بوون لە دەردی سەرییەکان، تەنها لە ڕێی باوەڕەوە مومکینە، چونکە چارەی فراوانکردنی کات و پەڕاندنەوەی بۆ ئەودیوی دونیا و بە بێ کۆتا کردنی، لەناو باوەڕ بە خودا و ڕۆژی دواییدایە.

ئەگەر سینەمایەك هەبوایە بیتوانیایە حاڵی دوای پەنجا ساڵی مرۆڤەکانی ئەم سەردەمەی پیشان بدایە، کێ دەیزانی چۆن شێوازی بەکارهێنانی کاتمان گۆڕانی بەسەردا دەهات؟ ئەم دەردەدڵییەی ئەو شاعیرە عەرەبەی کە ئەمەی بە چاوی خۆی نەك سینەما بینیوە، چۆن خەمێکی پڕ پەند بە با ناکا؟

لیت الشباب یعود یوما فأخبره بما فعل المشیب

واتە: "ئەگەر ڕۆژێك سەرلەنوێ گەنجێتیم بگەڕێتەوە، گلەیی ئەوەی لا دەکەم کە پیری چیی پێکردم".



هەموو مەسەلە گەنجێتییەك نییە گلەیی لێبکرێت، بەڵکو گەنجێتییەکە ببێتە مایەی شوکرانەکردن. چونکە تەنها لەپای گەنجێتییەکی وا، گەنجێتییەکی ئەبەدیی بەدەست دەخرێت.



# داهاتوو چۆن ڕزگار دەکرێ؟

## مرۆڤ بوونەوەرێکە بیر لە ئایندە دەکاتەوە

زۆر لەمێژ بوو لەگەڵ محەمەدی فەیلەسووف دەرفەتمان بۆ نەدەڕەخسا بەیەك بگەین. کە لە ڕۆژی دیدار و ئیمزامدا لە پێشانگای کتێب گەیشتینە یەك، ئەوەندە خرۆشام و دڵخۆش بووم، تەسەور ناکرێ... دیار بوو، ئەویش گەلێك بیریی منی کردبوو، "باشە ئەگەر وایە، ئەی بۆ لە کەیەکەوەیە یەکدی نابینین؟".

محەمەد وەڵامێکی زۆر کورتی ئەو پرسیارەی دامەوە:

**– مامۆستا! بۆ خۆت دەزانی دەبێ ئایندەمان ڕزگار بکەین...**

بەڵێ، بەڕاستی محەمەد لەسەر هەق بوو. گەورەترین خەمی گەنجانی هاوتەمەنی، ڕزگارکردنی ئایندە، واتە دەستەبەرکردنی داهاتوویەکی باشە بۆ خۆیان.

وتم:

– ڕاست دەکەیت و هەقتە. بەڵام ئایا بەتەواوی لەو وشەی داهاتوو و ئایندەیەی باسی دەکەین، تێدەگەین؟ واتە ئایا ڕزگار کردنی داهاتوو تەنها تەواوکردنی کۆلێژ و بوون بە خاوەنی پیشەیەك کە پارەی باشمان بەدەست بخات، دەگەیەنێ؟

ئێستاکێ من لە تۆ دەپرسم، داهاتووی ئەو داهاتووەی بیری لێدەکەیتەوە چەندێکە؟ پێت وایە ئەو داهاتووەی لە پێشتدایە چەند درێژ دەبێتەوە؟ ئەو وەبەرهێنانەی دەیکەیت بۆ چەند ساڵە؟

– مامۆستا! پێم وایە لە مەبەستەکەت دەگەم. خەمت نەبێ، ئەو داهاتووەی بیری لێدەکەمەوە ماوەیەکی کورت نییە... هەر لە ئێستاوە وا لە خەمی دۆزینەوەی ئیش و هاوسەرمدام. هەر وەك بیریشم لای پلانەکانە، بۆ ئەوەی لەو مەسەلانەدا پێویستم بە کەس نەبێ و تیایاندا سەرکەوتووبم. مامۆستا! دڵنیابە لەوەی محەمەدی فەیلەسووف خەجاڵەتبارت ناکات. تەنها یەك ساڵی دی، وەك ئەندازیارێکی سەرکەوتووی وا کە سەیرت پێی بێت، لە ئۆفیسی تایبەتی خۆمدا بەیەك دەگەین. وا هەر لە ئێستاوە خۆم بۆ ئەمانە ئامادە دەکەم... هیچ دوودڵ مەبە لەمە...

## داهاتووی دوور چییه؟

که لەگەڵ محەمەد لێکدابڕاین، بڕیارمان دا ئیتر زوو زوو یەکدی ببینین، من تا بڵێی ڕاڕا و ئۆقرە لێهەڵگیراو بووم، چونکە تێگەیشتنەکەی ئەوم بۆ ئاییندە، بەدڵ نەبوو. چۆن دەبێ محەمەدی فەیلەسووفی من، بیری ئەوەندە تەنگ بێ؟ چۆن ڕزگارکردنی ئاییندە تەنها لە دۆزینەوەی ئیش و ئاش (چێشت) و هاوسەردا دەبینێتەوە؟ ئینجا چۆن دەکرێ ئەو ئاییندەیەی ئەو بیری لێدەکاتەوە ئەوەندە ماوە کورت بێت؟ ئایا مرۆڤ لەسەریەتی تەنها بیر لە ئاییندەی نزیک بکاتەوە؟ ئەی مەگەر داهاتووی دووریش دانایی؟

باشە، داهاتووی دوور چییە؟

ئەم بابەتەمان لە پۆلیشدا خستە بەر باس. بیر و بۆچوونی جیا جیا هاتنە ئاراوە. بۆ نموونە: حەسەن، تێگەیشتنەکەی محەمەدی فەیلەسووفی بۆ ئاییندە بەدڵ نەبوو.

– مامۆستا! پێویستە گەنج بیر لە داهاتووی دوورتریش بکاتەوە. تەنها بیر لە ماوەی پیشەی نەکاتەوە، بەڵکو بیر لە کاتی خانەنشین بوونیشی بکاتەوە...

بە بۆچوونی عەلییش، نەدەبوو تەنها بیر لەخۆ بکرێتەوە، بەڵکو دەبوو بیر لە ماڵ و منداڵیش بکرێتەوە.

سەراب ڕەخنەی لە بۆچوونەکەی عەلی گرت و وتی:

- مامۆستا ! بیرکردنەوە لە ماڵ و منداڵانی خود بەتەنێ، خۆپەرستییە. دەبێ مرۆڤ بیر لە داهاتووی نەتەوە و نیشتمانیشی بکاتەوە.

وتم:

- ئافەرین سەراب! قسەیەکی زۆر جوانت کرد. ئەوەی هاورێکانیشت وتیان، بێگومان هەڵە نین... بەڵام لە ڕووی ڕزگارکردنی ئایندەوە، بەقەد پێویستیش نین... پێویستە ئێمە بیر لە ڕزگار کردنی ئایندەی دوورتریش بکەینەوە. ئێستا کێ دوورترین ئایندەمان پێدەڵێت؟

زۆربەیان تێگەیشتبوون دەمەوێ بڵێم چی. بەڵام چاوەکانی ئیبراهیم پڕ بوون لە بریسکانەوەیەکی وا کە موژدەی ئەوەیان دەدا جوانترین وەڵام دەداتەوە و لە هەموویان زیاتر دەیپێکێ.

مۆڵەتی دووانم دا بە ئیبراهیم. وەڵامەکەی هەر بەڕاستی جوان بوو:

- مامۆستا ! نابێ ئێمە هەر بیر لە داهاتوومان لەم دونیایەدا بکەینەوە، بەڵکو دەبێ بیر لە داهاتوومان لەو دونیاش بکەینەوە و هەوڵی ڕزگارکردنی ئەویش بدەین.

- هەی ئافەرین، ئیبراهیم! دوورترین ئایندەمانت زۆر باش ڕوون کردەوە، بەڵام پێویستە کەمێك ڕوون کردنەوە لەسەر ئەمە بدەم.

# ڕێی ڕزگارکردنی هەردوو ئاینده پێکەوە

ئایا ڕێی ڕزگارکردنی ئایندەی ئەم دونیا و ئایندەی ئەو دونیا لێک جیان؟

دەتوانین لە بەرانبەر ئەم پرسیارەدا بێ ئەملاوئەولا بڵێین: "نەخێر". چونکە گشت ئەو ڕێیانەی دەبنە هۆی ئەوەی لەم دونیایەدا سەرکەوتوو و خۆشنوودمان بکەن و لەو ڕێیەشەوە ئایندەمان ڕزگار بکەن، هەر هەمان ئەو ڕێیانەن کە داهاتوومان لە ڕۆژی دواییشدا ڕزگار دەکەن. هەر بۆیە، لە ئاینەکەی ئێمەدا کاروبارەکانی ژیانمان نەکراون بە دوو بەشەوە بە ناوەکانی کارەکانی دونیا و کارەکانی ڕۆژی دوایی. چی کاروباری ئەم دونیایە هەیە، گەر بەڕێکوپێکی و ژیرانە بێنە کردن، دەبن بە وەبەرهێنانێکی پڕ خێر و قازانج بۆ ڕۆژی دوایی. بۆ ئەوەی سەرلەبەری ژیانمان بکەینە پەرستشێك کە خێری زۆری هەبێ، پەروەردگارمان لە ڕێی کتێبە پیرۆزەکەیەوە کە قورئانە، جوانترین شێوەی ئەنجامدانی هەموو کار و کردەوەیەکی فێر کردووین. پێغەمبەریشمان (دروودی خودای لێبێت) لە ڕێی ژیانی خۆیەوە، جوانترین نموونەی بەرجەستەکردنی قورئانی لە ژیاندا، پێنیشان داوین. بەم شێوەیە مرۆڤایەتی ڕزگاری بووە لەوەی لە شوێنی تردا بەدووی جوانترین شێوازی قسە و جووڵە و هەڵسوکەوت و کامەرانەترین ژیاندا بگەڕێت. بۆ ئەوەی ژیانێکی

خۆش ببەینە سەر، بەنموونە وەرگرتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) لە گشت بوارەکانی ژیاندا بەسە. دەکرێ لە ڕێی لاسایی کردنەوەی ئەوەی ئەو کردوویەتی، کارە دونیاییەکانمان بکەین بە کارگەلێکی قیامەتی کە خێری زۆرمان بەدەست بخەن. بۆ نموونە: خواردن و خوارنەوە و پێکەنین و ئاخاوتن و گاڵتەکردن و تەنانەت نوستن وەك ئەوەی ئەو کردوونی، دەبن بە پەرستشی پڕ پاداشت. هەر هەنگاوێك کە هەڵیدەنێین، بێگومان بەو مەرجەی ڕووەو بەهەشت بێت، پەرستشە. لەم کلاوڕۆژنەیەوەیە پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) دەفەرموونێت: «**دونیا کێڵگەی ڕۆژی دواییە**».

## چۆن بە بەردێك دوو چۆلەکە ڕاو دەکرێت؟



ئێستا من لە ئێوە دەپرسم:

– بۆ ئەوەی لەم دونیایەدا سەرکەوتوو ببین، پێویست دەکات چۆن بژین؟

– دەبێ بەردەوام لە هەوڵدابین.

– دەبێ بە ڕێکی و بێدرۆ بژین.

– پێویستە بە بەرنامە و پلان بژین.

– گەرەکە خۆمان لەو هۆگرییانە لا بدەین کە مرۆڤ بەرەو هەڵدێری خراپەکاری دەبەن...

– بەڵێ، بۆچوونەکانی هەر هەمووتان جوان و بەجێن. دەتوانین بۆ ژیانێکی سەرکەوتوو و پڕ لە کامەرانی، چەندین خاڵی دیکەی وەك ئەمانە بژمێرین... ئا گشت ئەم مەرجانەی کە ژماردمان و ئەوانەش کە پێمان نایەنە ئەژمار و هاوشێوەکانیان، لە هەمان کاتدا ئەو پەرستشانەن کە فەرمانی خوداین... واتە ڕێی سەرکەوتوو و خۆشنوود بوونی ڕۆژی دواییشن. ناتوانین لێکیان جودا بکەینەوە. بۆ نموونە: کاتێك قوتابییەك وانەکانی باش دەخوێنێ و لەگەڵ خێزانەکەی هەڵدەکات و هەمیشە خەریکی ڕێز و خۆشەویستی نواندنە، ئەوا کاری هەم دونیا و هەمیش ڕۆژی دوایی دەکات. بەقاڵێك بێننە بەرچاوتان، ئەم بەقاڵە پیشەکەی بەپوختی ئەنجام دەدات، فێڵ لە تەرازوو ناکات، بە قازاجێکی کەم ڕازی دەبێت... ئایا ئەم کەسە کاری دونیا دەکات یان قیامەت؟

– هەم کاری دونیا و هەمیش هی قیامەت...

– دە باشە، با عائیشە پێمان بڵێ بۆچی ئەم بەقاڵە کە بەدوای ڕێیەکدا دەگەڕێ لە دونیادا قازانجی زیاتر بەدەست بێنێ، لە هەمان کاتدا وا حسێبە کار بۆ قیامەتیش دەکات؟

– مامۆستا ! بەقاڵێك بەڕێکی و بێدرۆ ئیشەکەی ئەنجام بدات، کڕیارەکانی دەستبەرداری نابن. لەبەرئەوەش کە ڕێکوپێکی و

هەوڵدان بۆ ڕۆزیی حەڵاڵ فەرمانێکی ئاینەکەمانە، لە هەمان کاتدا خێر و پاداشتیش بەدەست دێنێت.

– ئافەرین، عائیشە!... ئێستا بەتەواوی تێگەیشتین، زۆرێك لەو شتانەی بەو ناوەوە دەیکەین کە کاری دونیان، بەهۆی ئەوەی خێر و پاداشتیشمان بەدەست دەخەن، دەبن بە کاری قیامەتییش. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە موسوڵمانە باوەڕدارەکان، بە بەردێك دوو چۆلەکە دەپێکن.

پێدەچوو عەلی زۆر کەیفی بەم ڕاستییە هاتبێتەوە، وا خۆی پێنەدەگیرا لەوەی بڵێ:

– مامۆستا! ئەم ڕێیە ڕێی دان لە دوو چۆلەکە بە یەك بەرد و لە هەمان کاتیشدا ڕێی بەدەست هێنانی خێر و چاکەیە بەئاسانی و بەلاش و حەلاش.

– لەبەرچی بەدەست هێنانی خێرە بەبەلاش؟

– لەبەرچی؟! تۆ سەیر بکە، بۆ خۆمان نان دەخۆین، لە هەمان کاتدا لەبەرئەوەی وەکو خۆشەویست (درود خودای لێبێت) خواردوومانە، خێر و چاکە بەدەست دێنین. بۆ خۆمان هەم دەخەوین، هەمیش دەبین بەوەی کارێکی قیامەتیمان ئەنجام داوە...

# پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێ بێ) چیی کردبێت، ئێمەش دەبێ ئەوە بکەین

بەڵێ، موسوڵمانێتی ئاوا خۆش و ئاسانە... بەڵام دەبێ هەوڵ بدەین بزانین پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) ئەم کارانەی چۆن چۆنی ئەنجامداوە، تا بتوانین وەك ئەو بین و وەك ئەو بکەین. بۆ نموونە: گەر حەز دەکەن با چەند نموونەیەکتان بۆ بێنمەوە... پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) هیچ کاتێك ئەوەندەی نەخواردووە بەزۆر بپەستێتە گەدەیەوە. ئامۆژگارییشی بۆ ئێمە ئەوە بووە سێیەکی گەدەمان بە خۆراك و سێیەکیشی بە ئاو پڕ بکەین و سێیەکەکەی دیکەشی بەبەتاڵی بهێڵینەوە. ئەگەر لەگەڵ یەکەم هەست کردن بە تێر بوون لەسەر سفرە و خوان هەڵبسن، ئەوا سێیەکی گەدەتان پڕ بووە لە خۆراك. بۆ ئەوەی بتوانن ئەوەندە هەرس بکەن، دەبێ بەقەد سێیەکی تریشی ئاو بنۆشن. بەو یەك لەسەر سێیەیش کە بەبەتاڵی هێشتووتانەتەوە، ئەوا ڕێگەتان بۆی خۆش کردووە ئەوەی خواردووتانە بەباشی لێکی بدات و هەرسی بکات.

نوژداریی سەردەمیش، پشتیوانی لەم ئامۆژگارییە دەکات. واتە زانستیش دەڵێ: ئەگەر وەك ئەوە بکەن کە حەزرەتی موحەممەد

(دروودی خودای لێبێت) دەیفەرموو، ئەوا تەندروستیی خۆتانتان پاراستووە. کەواتە بڕوانن، خۆراك خواردن وەك ئەمە، هەم کارێکی دونیاییە و هەمیش قیامەتی، پاداشت بۆ ئەوانە مسۆگەر دەکات کە بەجێی دێنن.

خەوتن... لەم بابەتەشدا پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) جوانترین ئامۆژگاریمان دەکات بۆ تەندروستیمان: لەسەر لای ڕاستتان بنوون، دەستی ڕاستیشتان بخەنە ژێر سەرتان، قاچەکانیشتان لەلای چۆکتانەوە بەکەمی بنوشتێننەوە.

ئەم شێوازی نوستنە، شێوازێکی تەندروستییە و لە هەمان کاتیشدا لەبەرئەوەی وەك خۆشەویست (دروودی خودای لیٚ بێت)مان کردووە، خێر و چاکە بەدەست دێنین.

گشت کاروبارەکانی ژینمان، بەم شێوەیە دەتوانریٚ بکرێن بە پەرستش و بەندایەتی کردن بۆ خودا.



## ئەو سەرمایەی تەمەنەی
## وەك سەهۆڵ دەتوێتەوە و نامێنێ...



لەبەر گەرما و وشکیی بابەتەکە، کەشی پۆلەکە تێکچووبوو و بەشێك لە قوتابییەکان کەوتبوونە باوێشکدان. مامۆستاکە، وەك چۆن پێشتریش لە حاڵەتی ئاوهادا وای دەکرد، بڕیاری دا کەمێك ماوە بداتە باسەکە و پشوویەك بدات بە قوتابییەکان. باسەکەی گۆڕی و وتی:

– منداڵەکان! ئێستا دەفتەر و قەڵەمەکانتان دابنێن و پاڵ بدەنەوە. چیرۆکە مەتەڵێکتان بۆ دەگێڕمەوە. ئێوەش دوای ئەوەی کەمێك بیری لێدەکەنەوە، دەبێ هەڵی بێنن. کێ وەڵامی ڕاست بدۆزێتەوە، دە نمرە وەردەگرێ.

ڕەنگە ئێوە بەبیرتان نەیەت، پێشان بەفرگر (سەلاجە) لە هەموو ماڵێکدا نەبوو. بۆ سارد کردنی نۆشاوەکان، بە کیلۆ سەهۆڵ دەکڕرا. بەتایبەت ڕەمەزانان، هەموو کەسێك کە دەگەڕایەوە ماڵ، پارچەیەك سەهۆڵی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە.

لە ڕۆژێکی گەرم و لەو عەرەبستانەدا، زانایەك بە خۆی و قوتابییەکانییەوە بە شاردا دەگەڕا، لەو نێوانەدا بە لای سەهۆڵ فرۆشێکدا تێپەڕی. فرۆشیارەکە پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد: "موسوڵمانینە! ڕەحمێکم پێبکەن، خەریکە گشت سەرمایەکەم دەتوێتەوە و هیچی لێنامێنێتەوە!". زاناکە کە گوێی لەم قسانە بوو، یەکسەر حاڵی تێکچوو و بوورایەوە. قوتابییەکان هەڵیانگرتەوە و بردیانە بەر سێبەرێك و کەوتنە هەوڵدان بۆ بەهۆش خۆ هێنانەوەی.

ئێستا من لە ئێوە دەپرسم: دەبێ ئەو زانایە بۆ بوورابێتەوە؟ بەڵێ، یەك بە یەك دەستتان هەڵبڕن و بئاخفن، بەس سەرەتا باش بیری لێبکەنەوە...

ئۆرهان وتی:

– ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت خۆر لێی داوە.

– نەخێر. لەبەر ئەوەی ئەو لەو ناوچە گەرمەسێرەدا گەورە بووە، لە گەرما ڕاهاتووە. باشتر بیری لێبکەنەوە.

ئەحمەد وتی:

– بۆی هەیە فشاری خوێنی دابەزیبێت.

مامۆستا وتی:

– نا، پێشتر ئامـاژەم بەوە دا لە ڕووی تەندروستییەوە هیچ عەیبێکی نییە. محەمەد تۆ پێمان بڵێ...

محەمەد چاوەکانی دەبریقانەوە، هەڵسایە سەر پێ و بە متمانە بەخۆ بوونەوە وتی:

– مامۆستا! بە ڕای من ئەو زاتە، لەو سەهۆڵە تواوانەدا ژیانی خۆی و ڕەنگە هی هەموو خەڵکیشی بینیبێت. دوور نییە بیری لەوە کردبێتەوە کە سەهۆڵ فرۆشێك بۆ ئەوەی لە سەرمایەیەکی چەند دیناریـیدا زەرەر نەکات ئاوا دەکڕووزێتەوە، ئەی ئەو سەرمایەی تەمەنەی ئەو خەڵکە کە بە ملیار و تریلیۆنیش ناقەبڵێنرێ دەتوێتەوە و بە هەدەر دەڕوا؟ ڕەنگە بیری لەمە کردبێتەوە و لە بەرانبەر سامداریی ئەو ڕاستییە تاڵەدا، خۆی پێنەگیرابێ و لەهۆش خۆی چووبێ.

قسەکانی محەمەد وا گوێی بۆ شل کرابوو، فززەیەك نەدەهات. مامۆستا گۆمە مەنگەکەی شڵەقاند و وتی:

– زۆر ڕاستە، محەمەد! ئەو نمرەیەی شایانییت، دەتدەمێ.

د. یەشار چیل



# ئیسلام خۆشەویستییە

## گوتارێکی پێشکەشکراو لە تەلەفزیۆنی بەرلین

بینەرانی بەڕێز و خۆشەویست!

ئەگەر پرسیارێك بکرێت (ئیسلام چییە؟) و بوترێت دەبێ بەتەنها یەك ڕستە وەڵام بدرێتەوە، گومانی تێدا نییە کە دەکرێ هەزاران ڕستە بێنە وتن. بەڵام یەکێك لەمانە خاوەن جوانییەکی وەهایە کە لە هەمووان پتر گوزارشت لە ڕاستی دەکات و لە هەمووان زیاتر دڵ و ڕۆحمان خۆشنوود دەکات و هەستەکان لە ناخەوە ئاسوودە دەکات.
بە ڕای ئێمە، ئەوە ڕستەی «ئیسلام خۆشەویستییە»یە.

بەڵێ، بینەرانی خۆشەویست! هەر بەڕاستی لە ڕوانگەی گشت ئەو مانایانەی ئەم وشەیە هەڵیدەگرێ، ئیسلام خۆشەویستییە.

بەر لە هەر شتێك، وشەی شایەتومان کە بۆ بوون بە موسوڵمان، دەبێ بیڵێین و باوەڕمان پێی هەبێ، گوزارشت لە خۆشەویستی دەکات. چونکە کە دەڵێین: **«أشْهدُ أن لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهَ – من شاهێدی دەدەم کە لە ئەڵڵا بەولاوە خودایەکی تر نییە»**، ئەوە ئەو کات هەم باوەڕی قەتعیی خۆمان بەو خودایە دەردەبڕین، هەمیش خۆشەویستیمان تەنها و تەنها بۆ ئەو پەروەردگارە ڕاستەقینەیە تەرخان کردووە. لەوەوە موسوڵمان گەورەترین بەشی بێ پایانی کانگای خۆشەویستیی نێو دڵ و دەروونی بۆ خودا تەرخان دەکات و ئەوی لە هەموو شتێك پتر خۆش دەوێت. گشت خۆشەویستییەکانی تر لەو خۆشەویستییەوە سەرچاوە دەگرن و لە پێناوی ئەودان. لەم گۆشە نیگایەوە، خۆشەویستی بە گشت سنوورەکانییەوە، تەنها لە ناو ناخی مرۆڤی باوەڕداردا ڕەگ دادەکوتێ، چەکەرە و گەشە دەکات و وەك چڵ و پۆپی دار چنارێکی قەبە، فێنکی و ئاسوودەیی خۆی دەگەیەنێتە گشت کایە ماددی و مەعنەوییەکانی مرۆڤ. ئا بەهۆی ئەو فێنکییە ئاسوودەیی بەخشەی خۆشەویستییەیە، کە موسوڵمان هەموو شتێکی خۆش دەوێت. بە خۆشەویستییەکی بێ کۆتا و بێهاوشان و پڕ جۆشەوە هەموو شتێکی خۆش گەرەکە، چونکە هەموو شتێك دەستکرد و بەرهەمی خودای گەورەن. ئەو خودایەی کە

موسـولّمان ئـەوی لـە هـەموو شـتێك زیـاتر خـۆش دەوێـت. ئـەو موسـولّمانەی لـە سـایەی ئـەو خۆشەویسـتییەدا مانەنـدی (یـوونس ئەمرە) لە ژیان دەڕوانێت و دەڵێت:

لێبووردە بە لە ئاستی مـەخلووق
هـەر تـەنها لەبـەر خـاتری خـالق

دیسـان هـەر یـوونس ئـەمرە وەك وەرگێڕێکـی حـاڵی موسـولّمانە هەقیقییەکان ئاوا دەڵێ:

مـن نـەهاتـووم بـۆ بانگـەواز
ئیشـی مـن ڤینـە بـێ ئـەنـداز

شـوێنـی خـودا دەروونـەکـانە
هاتووم دەروونـان بکـەم بـە لانـە

خۆشەویستیی کەرەستەی بیناسـازیی مەعنەوییـە. موسـولّمان لـە ڕێـی کەرەسـتەی خۆشەویسـتییەوە پتـەوترین و قـایمترین خشـتی برایەتی و دۆستایەتی دەخاتە سـەر یـەك و هەڵیدەچنێ. هـەر بۆیـە، ئەوەی کە لە هەمووان زیاتر خۆشمان دەوێ، دەبێ خـودای گـەورە و پاشانیش دوا پەیامبەری خودا بێت (درودی خودای لێبێت).

ئێمە وەك موسوڵمان، خودامان لە هەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێت. چونكە ئەم خۆشەویستییە تایبەتە بەو زاتەی خولقێنەری هەموو شتێكە. گەنجینەی خۆشەویستیمان بەپێی فەرمانی خالقمان دەبەخشینەوە... ئەوەی كە وەك هەموو جوانییەكانی دی، خۆشەویستیی بێبنی نێو دەروونیشی پێبەخشیوین، هەر خودای گەورەیە. هەر بۆیە خۆش ویستنی ئەو كەسەی ئەو هەستە جوانەی ناوی خۆشەویستییە پیێ بەخشیوین، لە هەموو شت و هەموو كەسێك زیاتر و بە شێوەیەك كە ئەوەندە زۆر بێت نەپێوریێ، قەرزێكە لە ئەستۆمان.

كاتێك بیر لە بابەتی خۆشەویستیی دەكەینەوە، دیسان ئەوە ڕوون دەبێتەوە كە دەبێت خالقمان لە هەموو شتێك زیاتر خۆش بویێ. خودای گەورە، لەبەرئەوەی دروستكەر و سەرچاوەی گشت جوانییەكانە، خاوەنی كەماڵ و جوانییەكی بیێ كۆتایە. ئەو خودایەی كە خاوەنی باڵاترین و بیێسنوورترین كەماڵ و بەرزی و جوانییە، لە ئیحسان و بەخشندەیی خۆی، گشت دروستكراوەكانی -لە گیاندار و بیێگیان- خستووەتە ژێر سۆز و بەزەیی خۆیەوە. هەر بۆیە ئەو پەروەردگارە مەزنەی كە سیفاتی جەمال و كەمال و ئیحسانی، وێڕای ئەو هەموو سێبەر و پەردەیەی دەیانەویێ دایبپۆشن، لەم دونیایەدا ڕەنگ دەداتەوە. چەندێك خۆشمان بویێ، هەر كەم و نوقسانە و بارتەقای ئەوە نییە كە پێویستە.



# ژیان چییە؟

لە باپیرمم پرسی: "ژیان چییە؟".

وەڵامی دامەوە: "نێوانی بانگ و نوێژە."

- "ئەمە یانی چی؟! ژیان ئەوەندە کورتە، باپیرە؟!"

بە زەردەخەنەیەکەوە:

- "ئەی بۆ تۆ وات دەزانی چەندێکە؟... بەڵێ، ئەوەندە کورتە!..."

ئینجا پرسیی:

- "بەڵام دەزانی ئەو بانگ و نوێژە چین؟"

نەمزانی، پرسیم:

- "چین؟"

- "نوێژەکە نوێژێکی بێبانگە و بانگەکەش بانگێکی بێنوێژە".

کە وتم :" ئەوانە چین، بابە گەورە؟!"، دەستێکی بەسەرمدا هێنا و وتی:

"- ئەی ئەوە نەبوو دوێنێ شەو لەبن گوێی نەوزادەکەی مامە تاڵیبت بانگمان دا... مەگەر ئەوە بانگی بێنوێژ نەبوو؟!"

پرسیم:

"- ئەی نوێژی بێبانگ؟"

سەیرێکی ڕوخساری کردم، لێم ڕاما و وتی:

"- ئەو ڕۆژەی باپیرت دەمرێ، فێری ئەوەشیان دەبیت".

**نورەددین پاڵا**

ئەوەش هەیە، کاتێك خۆشەویستیی خودا ئاوا دەبێتە هەستی بنەڕەتیی دڵانمان، خۆش ویستنی ئەو شتانەش کە دروستی کردوون، وەك خۆش ویستنی زاتی ئەوی لێدێت. لەبەر ئەوەی موسوڵمانی بەهەست، هەموو خۆشەویستییەکانی بە ناوی خوداوە دەکات. لەبەر خودا، هەموو شتێکی خۆش دەوێت... چونکە هەر چییەك هەیە، جێدەست و هونەری ئەوە. پێغەمبەریشمان (دروودی خودای لێبێت) لە فەرموودەیەکیدا ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە «خۆش ویستن لە پێناوی خوادا، لە خۆشەویسترین بەندایەتییەکانە بۆ خودا».

کە وا بوو، بینەرانی خۆشەویست! با ئەو سەرمایەی خۆشەویستییەی نێو دڵمان ڕاستەوڕاست ڕووی بکەینە خودا. با بەدیهێنەری خۆمان خۆش بوێت، خۆشویستنێکی بێکۆتا. با بە پێ دانی گشت یان بەشێك لەو گەنجینەی خۆشەویستییە بە غەیری ئەو، ناهەقی نەکەین. بەڵام بۆ ئەوەی بە هەڵە لێك نەدرێتەوە، با هەر ئێستا وەڵامی پرسیاری: "ئایا ئەو کەسەی تەنها و تەنها خودای خۆش دەوێ، ئیدی نابێ هیچ بوونەوەرێکی ئەم دونیایەی خۆش بوێ؟"، بدەینەوە.

بێگومان خۆشی دەوێن، چونکە هەموو ئەو شتەی مرۆڤ لەم دونیایەدا خۆشیی لێدێ و خۆشی دەوێ، خۆی لە خۆیدا دیارییەکی پەروەردگارە بۆی. مرۆڤی باوەڕدار، شتە فانییەکانی ئەم دونیایەشی

هەر خۆش دەوێت، چونکە ئـەوان بوونـەوەرانێك نـین هـەر لـەخۆوە و بەڕێککەوت دروست بووبن و هیچ ئامانجێك لەپشت بوونیانەوە نەبێت.

ڕێـك بەپێچـەوانەوە، ئەوانــە ئــەو ســەنعەتە ئیلاهییانــەن، کــە پەروەردگاری مەزن، بۆ ئێمەی مرۆڤ – کە فـرە خۆشمـانی گەرەکـە، سازی کردوون و کردوونی بە دیاری. کەواتـە بـۆ نموونـە: دارسـێوێك، لەناو دڵی موسڵمانێکی بـاوەڕداردا خۆشەویسـتییەکی فـراوانتر و ڕەگ داکوتــاوتر دادەمــەزرێنێ، چـونکە ئـەوە سـەنعەتێکی ئلاهییـە. ئـەو خودایەی هەموو شتێکی بەدیهێناوە، ئەم درەختەشی هەر بۆ سوودی مرۆڤ بەدیهێناوە. بۆیە هەر ئەوە نییە درەختێکی سادە بێت و تەواو، بەڵکو دیارییەکی گەلێك بەهاداری خودایە بۆ مرۆڤ، چونکە دار سـێو،



بۆ خۆی قوڕاو دەخوات، کەچی ئەو سێوە خاوێن و تام خۆشە دەبەخشێتە ئێمە.

ئێستا با بیربکەینەوە، کەسێك لەم گۆشەنیگایەوە بڕوانێ، دایك و باوکی خۆش ناوێ؟ ئەو دوانەش دوو بەخشایشی بێهاوتای خودان کە بەخشیونی بە مرۆڤ. بەتایبەت لە کاتی پیربوونیاندا، چەندێك پێویستە باڵی میهرەبانییان بۆ ڕابخەین. ئەی جگەرگۆشەکانمان، ئەوان دیاری و ئەمانەتی کێن لای ئێمە؟ ئەی ئەو کەسەی دایك یان باوکی منداڵەکانمانە، مەگەر شایانی خۆشەویستییەکی زیاتر و پیرۆزتر نییە؟ ئەی وەرزی بەهار، ئەو وەرزەی پەروەردگار ساڵی جارێك دەیبەخشێتە زەویمان، تا بگەشێتەوە و ببێتە مایەی خێر و بەرەکەتی زۆر بۆ ئێمەومانان، مەگەر بەڵگەیەکی ڕەحمەتی خودایی نییە بۆ ئێمە؟

مرۆڤ بەم چاوەوە بڕوانێت، وای بۆ دەچێت کە چی جوانیی هەیە لەم دونیایەدا، جێدەستێکی جوانیی خودایە و، بەو هۆیەشەوە هەموویانی زیاتر و جددیتر خۆش دەوێت. ئا لەبەر ئەمەیە دەڵێین: "ئیسلام خۆشەویستییە"... ئەو خۆشەویستییەی ئیسلام واجبی دەکات، پێویستییەکی بنەڕەتیی ڕۆح و دەروونیشمانە. چونکە هەویری بەدیهێنرانمان بە خۆشەویستیی شێلراوە، نەك کینە و دوژمنایەتیی. لە ئایەتی ٥٤ی سوورەی (ئەلمائیدە)دا تایبەتمەندییەکی موسوڵمانانی ڕاستەقینە بەم جۆرە ڕوون

کراوەتـەوە: ﴿يُحِبُّهُمْ وَ يُحِبُّونَـهُ﴾ واتـە: «خـودا ئـەوان و ئـەوانیش خودایان خۆش دەوێت».

دوا پێغەمبەری خودا، کـە پێغەمبـەری خۆشەویسـتی و ڕەحمەتـە (دروودی خوای لەسەر بێ)، بەم شێوەیە نزاخوازیی دەکرد:

**«خوایـە گیـان! خۆشەویسـتیی خـۆت و خۆشەویسـتیی خـۆش ویسـتنی تـۆ و خۆشەویسـتیی ئـەوەی لـە خۆشەویسـتیت نـزیکم دەکاتەوە، بەنسیبم بکە... »**

ئـەم ڕسـتانە ئـەوەمان پێـدەڵێن، ئەگـەر خـۆش ویسـتنی خـودای گەورە لە دڵماندا ڕەگ دابکوتـێ، ئـەوە گشـت خۆشەویسـتییەکانی تـر تەنها بەکەڵکی ئەوە دێن ئەو زیـاد و پتـەو و بەجۆشـتر بکـەن. وەلـێ ئەگەر خۆشەویستیی خودا لە لەسـەر تـەختی دڵ دانەنیشـتبێ، ئـەوە خۆشەویستییەکانی تریش دەبن بە بێ بنەما و فانی. بیربکەنەوە ئایا ئەوەی وا بیردەکاتەوە کە سێو دیاریی خودایە، زیاتر خۆشی دەوێ و پـتر تـامی لێـوەردەگرێ یـان ئـەوەی دەڵـێ هـەر لـەخۆوە و بەڕێککـەوت دروسـت بـووە و هـەر میوەیەکـە و هیچی تر؟



لێـرەدا دەبـێ پرسـیارێك بـە خەیاڵمانـدا بـێ: باشـە، **کـورتترین ڕێگەی خۆش ویستنی خودای گەورە**

به شێوەیەك لایەق بێ بەو زاتە و، خۆ خۆشەویست کردنیش لای کامەیە؟

خودای گەورە بۆ ئەمەش نموونەیەکی زیندووی بۆ ناردووین، کە ئەویش پێغەمبەری ئازیزمانە (دروودی خودای لێبێت). کەواتە کورتترین و سەلامەتترین ڕێگەی خۆش ویستنی خودا وەك ئەوەی پێویستە و خۆ خۆشەویست کردنیش لای، خۆش ویستنی ڕەسولوڵلا و هەوڵ دانە بۆ پابەندی کردن لە سوننەتەکەی (واتە شێوازی ژیانی). ئەمە لە ئایەتی ٣١ی سوورەی (ئالی عیمران)دا بەم شێوەیە ئاماژەی پێدراوە:

﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾

واتە: «(موحەممەد!) پێیان بڵێ: ئەگەر خوداتان خۆش دەوێ، شوێنی من بکەون. (ئەو کات) خودا خۆشی دەوێن و لە گوناهەکانیشتان خۆش دەبێت».

***

نیوەی دووەمی شایەتومانیش کە یەکەم پایەی ئیسلامە، ئەوەیە بڵێین «وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ – شاهێدی ئەوەش دەدەم کە موحەممەد بەندە و نێردەی ئەوە». بەم جۆرە لە یەکەم بەشی ڕستەی چوونمان بۆ نێو ئیسلام، گوزارشت لەوە دەکەین کە باوەڕمان بە خودا و لە بەشی دووەمیش بە دوا پێغەمبەری هەیە( دروودی

خوای لەسەر بێ). بەم جۆرە خودای گەورە لەو ڕستەیەدا کە مەرجی چوونە ناو ئاینی ئیسلامەوەیە، ناوی خۆی و هی پەیامبەرەکەی خستووەتە پاڵ یەکەوە. بێگومان وەك چۆن لە باوەڕ پێبووندا وایە، لە خۆشەویستییشدا کە پێویستییەکی ئەو باوەڕەیە، دەبێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) یەکسەر لە دوای خودای گەورەوە بێت.

ئەگەر ڕاستیشتان دەوێ، ئێمە ئەو پێغەمبەرەمان هەر چەنێك خۆش بوێت، هەر بەقەدەر ئەوە نابێت کە ئەو ئێمەی خۆش دەوێت. ئەو پێغەمبەری خۆشەویستییە، پێغەمبەری خەشم و قین نییە... ئەو، ئەوەی بۆ کوشتنی هاتووە، لای ئەو زیندوو بووەتەوە. کاریگەری موعجیزانەی ئەو، لەو عومەری کوڕی خەتتابەی بۆ کوشتنی هاتبوو، حەزرەتی عومەری سیمبولی دادگەریی دەرهێنا و بۆ ئیسلام کردی بە دیاری...

***

موسوڵمانی ڕاستەقینە، بە ئیلهام وەرگرتن لە خودا و دوایین و گەورەترین پێغەمبەرەکەی (دروودی خودای لەسەر بێ)، هەموو شتێکی خۆش دەوێت و لە ئاست ئەو کەسە بەدکارانەش کە خراپەی لە بەرانبەردا دەکەن، تەنها سکی پێدەسووتێن. تەنانەت بۆ دەرهێنانیان لەو خراپەکارییەی تێیدان، گیانبازانە تێدەکۆشێت و ئەمەش بە پەرستشێکی زۆر گەورە دادەنێت.

کەسێك گەیشتبێت بە هەستی باوەڕەکەی و تامی کردبێت، کێشە و موسیبەتەکانی سەریشی خۆش دەوێت. دەزانێت کە ئەوانە بە فەرمانگەلێکی مەعنەوییەوە پێی دراون. هەموو دەردەسەرییەك فەرمانی مەزنی هەیە لە پێگەیاندنی مرۆڤ و پەرەپێدانی مرۆیی.

موسولمان بەو خۆشەویستییە پیرۆزەی لە ئۆقیانووسی مەحەببەتی خودا و پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) سەرچاوەی گرتووە، هەوڵی شێواندن و تێکدان و پەرت کردن نادات، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەکەوێتە هەوڵی ڕێکخستن و چاککردنەوە و کۆکردنەوە. با ناخی خۆمان شەنوکەو بکەین. ئەگەر بەڕاستی هەوەسی تەعمیر نەك تەخریب، دڵ ڕاکێشان و یەکخستن نەك دڵ شکاندن و پەرت کردن، خوازیاریی تەبایی نەك دووبەرەکی، لە ناخماندا زاڵ بێت، ئەوا ئەو کات ئێمە کەسانێکین بەڕاستی باوەڕمان هێناوە بە گوزارشتی ئاینی بووین بە موسوڵمانی کامڵ...

بەڵێ، خوێنەرانی بەڕێز و خۆشەویست! کاری ئێمەی موسوڵمان «خۆشویستنی خۆشویستن»ە. هەر بۆیە، دەڵێم: "بژی خۆشەویستیی، بمری کینە و دووبەرەکیی". هیوای دەروونێکی پڕ لە خۆشەویستیی بۆ هەمووتان دەخوازم – خۆشەویستییەك لە عەشقی خودا و پێغەمبەرەکەیەوە ئیلهام وەربگرێت.

## مرۆڤ

## جوانی لە ناخیدا هەبێ،

## هەموو شتێك جوان دەبینێ



لە ژوورێکی نەخۆشخانەدا دوو نەخۆش خەوێنرابوون، یەکێکیان لەلای پەنجەرەکەوە و ئەوی تریشیان لە دووری پەنجەرەکە و لە نزیك دەرگاکە خەوێنرابوون. نەخۆشەکەی لای پەنجەرەکە ڕووی وەردەگێڕایە لای پەنجەرەکەوە و ئەوەی ڕۆژانە دەیدی، بۆ دڵخۆش کردنی هاوژوورەکەی، زۆر بەچێژەوە دەکەوتە گێڕانەوەیان...

ئەمڕۆ هەموو لایەك سەوزەلانە، هەڵووژەکان گوڵیان کردووە. ئەی ئەو شالوورە نازدارانە... لەسەر چڵی درەختی هەڵووژەکان وەستاون و دەخوێنن... دڵۆپێك هەور بە ئاسمانەوە نییە. منداڵە بچکۆڵەکان لە قوتابخانە دەگەڕێنەوە، ئای لەو بزێوانە!... ئای خوایە گیان، چ دیمەنگەلێکی جوان و دڵڕفێنن!

ڕۆژگار بەم جۆرە دەگوزەران، نەخۆشەکەی پاڵ پەنجەرەکە هەر ڕۆژەو شتی نوێتر و دڵگەرەوەتری دەگێڕایەوە.

... تا ئەوەی شەوێك، ئەو نەخۆشە هەستی کرد خەریکە نەخۆشییەکەی زۆری بۆ دێنێ، هەوڵی دا دەست ببا بۆ عیلاجەکانی.

بـەلاّم قوتـووی داوودەرمانەکـە کـەوتبووە سـەر زەوی. نەیـدەتوانی ڕاکشێ و هەر دەبـوو عیلاجـەکانی وەربگـرێ. زۆری لـە خـۆی کـرد تـا توانی دەنگی دەربچێ و بانگ بکاتە هاوڕێکەی:

– براکـەم! قوتـووی عیلاجـەکانم کەوتووەتـە سـەر زەوی، نـاتوانم هەڵیبگرمەوە... دە توخوا، تۆ بـۆمی هەڵـدەوە... بـۆمی هەڵـدەوە... دەزانم نوستووی... توخوا... توخوا...

نەخۆشـەکەی لای دەرگاکـە خـۆی وا دەردەخسـت گـوێی لێنییـە. بیویستایە، دەیتوانی زۆر بەئاسانی هەڵیبگرێتـەوە و بـۆی هەڵداتـەوە. بەلاّم واینەکرد. چاوەڕێی کرد... ئەو نەخۆشەی ناڵـە نـاڵی بـوو، دوای کەمێك گیانی سپارد.

کە ڕۆژ بووەوە، پزیشکەکان هاتن. نوێنی نەخۆشە مردووەکە چۆڵ کرا. نەخۆشەکەی تریش، گەیشتە لای ئـەو پەنجەرەیـەی چـەند مـانگ بـوو ئـاواتی بـۆ دەخواسـت. چـاوەکانی بزەیـان دەهـاتێ. لـە شـوێنە نوێکەیدا خەوێنرا.

کە لە ژوورەکەدا بەتەنها مایـەوە، بەخۆشـییەوە کەوتـە ڕوانـین لـە پەنجەرەکـەوە... ڕوانیـی، وەلـێ هیچـی نـەبینی، چـونکە لـەو دیـوی پەنجەرەکــەوە دیــوارێکی قــەترانی هــەبوو کــە چــەند ســاڵ بــوو هەڵچنرابوو!..

ئێستا ئەوەی بەڕاستی مردووە کامیانە؟ بیری لێبکەنەوە بزانم...

نەدیم گوربوز (ئەزاك)

(نامە بۆ دۆستان، لاپەڕە ١٠٨-١٠٩)



# هەرەسی خۆرئاوا

## ڕەنگ دانەوەکانی لە بەرلین

خۆرئاواییەکان هەر خەریکی خواردن و خواردنەوە و ڕابواردنن. تەنانەت ئەو خەڵکەی (ڕۆما)ش کە بۆ ئەوەی بتوانن دیسان بخۆنەوە ڕایان دەکردە حەوزەکانی ڕشانەوە و خۆیان دەڕشاندنەوە، ناگەن بە خۆرئاواییە نەوسنەکانی سەردەم. هەر بۆیە گەورەترین خەمی مرۆڤی خۆرئاوایی ئەم سەردەمە لاواز بوونەوەیە. ساڵانە ملیۆنان یۆرۆ لە خۆ زەعیف و باریك کردنەوەدا خەرج دەکرێت و چەندین نۆڕینگە کراونەتەوە کە ڕۆژوو لەژێر ناوی جیا جیا وەك چارەسەرییەك بۆ مرۆڤەکان بەکاردەهێنن.

خۆرئاوا خەریکی خواردنە... ئینجا چی باشترین بەرهەمی هەموو وڵاتانە، وەك نموونەیەکی ڤێزەونی ئیسراف، بێ تێر بوون دەخوا و بەکار دەبا. لە ڕێی ئەو داگیرکارییەی کە ئێستاشی لەگەڵدا بێ لە وڵاتە ئەفریقاییەکان بە دزی بێ یا ئاشکرا درێژەی هەیە، خەڵکیان خستووەتە خزمەتی خۆیان، بە بەرانبەرێك کە لەگەڵ هیچدا ئەوەندەی فەرق نییە. تەنانەت لە هەندێك شوێندا، خەڵکی ناوچەکە ئەو بەرهەمە نایابانەی بۆ ئەفەندییە خۆرئاواییەکان بەرهەمیان دەهێنن، خۆیان پێیان ناکڕێت و ناتوانن بیخۆن. بەم جۆرە خۆرئاواییەکان بەو بەرهەمە خۆراکییانە دەژین کە غەریب حاڵ و برسییەکان چاویان لێیە... تۆ بڵێی لەبەر ئەوە نەبێ، ئەو جەستانەی ئەو خۆراکانە دەخۆن هیچ هەست بە خۆشی و کامەرانیی ناکەن؟!

ئایا خۆرئاواییەکان بەس دەخۆن؟ نا، دەشخۆنەوە... تەنانەت ئەگەر بڵێی خوارنەکەشیان هەر بۆ خواردنەوەیانە، ڕەنگە هەڵە نەبێ. بەدەستی ئەوانەی لە ڕێ و ماڵەوە و لە سەر کار و ناو شەمەندەفەر و شوێنی وەستان و پارك و کورتییەکەی هەموو شوێنێکدا بەلادا دێن، قوتوویەك بیرە هەیە. بۆیە بیرە کە (لای ئەوان) بە شەراب لەقەڵەم نادرێ، دێن بە تێکەڵ کردن لەگەڵ خواردنەوە کحوولییەکانی دی بەهێزی دەکەن. ئەی ماددە هۆشبەرەکان؟!... بەکارهێنانیان هەر لە منداڵانی دوا قۆناغەکانی بنەڕەتییەوە دەست پێدەکات. خۆرئاوا خەریکە هۆشی لەخۆی نامێنێ. بەو هۆش لەخۆ نەمانەش شێت و هار

بوون. دەڵێی ئەوەی ئەو دێڕە هۆزانەی هۆزانڤانی ئێمەیان بۆ خۆ کردووەتە دەستوور:

هیچ بیرمەکەوە، بەس ئاوات بخوازە
سەیرکە مێرووەکانیش ئەوە کاریانە

بەشێکی زۆری جڤاك، وای لێهاتووە شەرم لە وشەی شەرمە دەکات... بەتایبەت گەنجەکان، چەمکێکی وەهایان هەر بەخەیاڵیشدا نایات. وەك بڵێی بەلای ئایدزیش دەرسی پێویستی دانەداون...

مرۆڤی خۆرئاوایی کە بە هەستە هەرسی و زایەندییەکانییەوە دەژی، تا دێ بێسەروبەرتر دەبێت و دەبێ بە ڕۆبۆت، بگرە بەو ڕێژەیەی لە هەستە مەعنەوییەکان دوور دەکەوێتەوە، بەرەو ئاژەڵێتیش دەچێت. خەریکە وای لێدێت ژیانیان لەگەڵ هی ئەو سەگانەی کە زۆر هۆگریانن و وەك بڵێی بێ ئەوان نایانکرێ، جیاوازییەکی وایان نەمێنێت. بێگومان سەرتاپای جڤاکی خۆرئاوا وا نییە، بەڵام بەخێرایی بەرەو ئەوە دەچێت وایلێبێت.

## سیستەمی پەروەردەی هەرەس کردوو

لەم مانگانەی دواییدا (دێر شپیگل) کە یەکێکە لە بەناوبانگترین و باشترین گۆڤارەکانی ئەڵمانیا، سیستمی پەروەردە و قوتابخانەکانی ئەڵمانیای کردە تەوەری سەرەکیی خۆی. خاڵی هاوبەشی بۆچوونی

پەروەرشیاران کە یەك لەیەك پەندئامێزتر بوون، لە ڕستەیەکی زۆر سەیردا کورت بووبووەوە:

"قوتابخانەکانمان بوون بە تیمارخانە".

بە ناوی پڕەنسیپی ڕێزگرتن لە مرۆڤ، ئازادییەکی بێسنووریان داوەتە گەنجان، بەڵام ئێستا وا خەریکە لەژێر ئەو گەرەلاوژەیەی لەو ئازادییە بێ سنوورە کەوتووەتەوە دەناڵێنن. لە قوتابخانەکاندا ڕێ بە جگەرەکێشان دراوە، لێدان قەدەغەکراوە، وانەکان کراون بە تەرفیهی... بۆیە بەهۆی ئەم سیستەمەوە وای لێهاتووە مامۆستا لێدان دەخوا، بە جۆرێك وەك خەمۆکترین چینی کۆمەڵ دیاری کراوە.

ژمارەی ئەو دایکانەی هێشتا لە تەمەنی منداڵیدان، ڕێژەی ترسناکی تۆمار کردووە. هاندانیش لە ڕاگەیاندنە نووسراو و بیستراو و بەتایبەتیش بینراوەکاندا، گشت سنوورێکی بەزاندووە.






● حاڵی مرۆڤی خۆرئاوایی، لە هی ئەو کەسەی نێو کاریکاتێرەکە دەچێ. پێی وایە پاك بووەتەوە، کەچی خۆی بەتەواوی لە پیسی وەرداوە.

## سەگ شوێنی منداڵی گرتووەتەوە...

بێگومـان ئـەوەی لـەم نێوانـەدا ڕوودەدات، بەسـەر خێزانـدا دێـت. پەیوەندیی ژن و پیاو لە گشت بـەها بـاڵا و پیرۆزەکـان دادەتاشـرێ و دادەبەزێنرێتە ئاستی ئەوەی کە تەنها هۆکارێکی هەوەسـبازی بێـت و لە سادەش سادەتر بکرێت... بۆیە ئیتر وتنی خێزان بەو پێکەوەییەی لە دوورەوە وەك خێزان دیارە، تا دێ زەحمەتتر دەبێت. بـەهۆی ئـەو هەستە ماددەگەرا و خاڵی لە خۆشەویستی و بەو هۆیەشەوە دابڕاو لە فیداکارییـە، خەریکـە وا لێـك بدرێتـەوە کـە منـداڵ بـارێکی گرانـە بۆئەوەی شتێکی پێویستیش بێت... لـە ئـەڵمانیا وێـڕای ئـەوەی بـۆ هەر منداڵێك ١٢٠٠ مـارك بـۆ مـاوەی دوو سـاڵ دەدرێـت، بـەڵام هـەر نەتوانراوە وا لە خێزانەکان بکرێت حەزیان لە منداڵ خستنەوە بێت. ڕێژەی دانیشـتووان سـاڵ بـە سـاڵ لـە داکشـاندایە و هـەر چـەنێکیش هـەوڵی ئـەوە دەدرێ بـەرەو هەڵکشـان بـبرێ، بـەڵام هاوڵاتییـان هـەر بەخێوکردنی سەگیان لە منداڵ پێباشترە. ئەو پیسـاییەی سـەگ کـە ڕۆژانە تەنها لە شەقامەکانی بەرلینـدا هەڵدەگیرێتـەوە، ١٦ تەنـە!... هـەر لـە ئـەڵمانیا لـە سـێ هاوسـەرگیریدا، یـەکێکیان بـە جیابوونـەوە کۆتایی پێ دێت.

هەستە باڵا مەعنەویی و ڕۆحییەکان لای لاوی ئەڵمانی بەرەو بوون بـە سـفر دەڕوات. گـەنجی ئـەوێ وەك بلێـی خـەواڵووە و تاقـەتی بـیر

کردنەوەی نەماوە، لە ژیانیدا کە بەهۆی هەندێك هەستییەوە بووە بە ژیانێکی ئاژەڵانە لە شوێنکەوتنی هەوەسە ماددی و زایەندییەکان بەولاوە خەمێکی تری نییە... ترسی یاسا و پۆلیس نەبێ کە زۆر توندن، دوور نییە هەر لە ئێستاوە جڤاك لەنێو لافاوێکی مەعنەویدا بخنکێنێت.

## ئایا خۆرئاوا خێرخوازە؟

هەستە باڵاکانی وەك خۆشەویستیی دایك و باوك، سۆزی منداڵ، هەستی خێرخوازیی، تەبایی نێوان دراوسێکان، بەدەمەوە چوونی خزمان، تەنها لە چوارچێوەیەکی وشك کە بە یاسا سەپێنراوە سەیریان دەکرێت. لەبەر ئەوەی کەس بێ بەرانبەر شت نادات بە کەس و لەبەر ئەوەش کە ڕەزای خودایی فەرامۆش کراوە، تەنانەت دەرۆزەکارانیش تەنها دوای ئەوەی شتێك دەدەن ئینجا داوای یارمەتیی دەکەن. ئیتر یەکێك گۆرانی دەچڕێ، یەکێکی تر لەسەر زەوی نیگار دەکێشێ، یەکێك ئامێرێکی موزیك دەژەنێ، یەکێکی دیکەش جووڵەیەکی سێرك ئاسا دەکات و لە ڕێیەوە هەوڵی دەست خستنی سێ چوار قرووشێك دەدات.

چی؟! وتتان یارمەتیدانی ئەفریقا؟ حەز دەکەن با (مارکۆ فێراری)ی دەرهێنەری بەناوبانگی ئیتاڵیایی چیرۆکەکەیتان بۆ بگێڕێتەوە:

ئەو دەرهێنەرە بەناوبانگە کە لە چەندان ڕۆژنامە و گۆڤاردا ڕێپۆرتاژی لەمەڕ فیلمەکەی خۆی کە بەناوی **«ئەوەی سپی پێستەکان دەیکەن کاسبییە»** بڵاوی کردووەتەوە، دەڵێت: **"ئەو یارمەتیدانەی ئەوروپاییەکان دەستیان داوەتێ بۆ ئەفریقا، تەڵەیەکی شەیتانانەیە. ئەم یارمەتییە لە داگیرکاری مەترسیدارترە"**. لەو فیلمەشیدا جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەفریقاییەکان چاوەڕوانی ڕزگاربوونن لەسەر دەستی ئیسلام نەك ئەوروپا، هەر وەك باسی ئەوە دەکات کە ڕەش پێستەکان قورئانیان لا پەسەندترە لە ئینجیل و، بەهۆی ئەو داڕووخانەشەوە کە ئەوروپا ڕووبەڕووی بووەتەوە، ئیدی لە ئەفریقا مەیدان بۆ ئیسلام چۆڵ بووە، چونکە دەڵێ: **"ئیسلام ئاینێکی زیندووە و دەخرێتە بواری ژیانەوە"**. ئەم فیلمە کە دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو،



وای لێهات ڕۆژنامەی «لاییبێرەیشن- *Liberation*»ی فەرەنسایی، چوار لاپەڕە (لە نێویشیاندا لاپەڕەی یەکەم)ی بۆ تەرخان بکات. گۆڤاری «لیٚ نۆوڤلٚ ئۆبسێرڤاتۆر - *Le Nouvel Observateur*»، بە نووسینی دوو نووسەری جیا، ڕەخنەی لە فیلمەکە گرت. فێراری لەم فیلمەیدا ئەوروپا دەهەژێنێت و بگرە سەرکۆنەشی دەکات.

بەتایبەت ئەو کار و چالاکیانەی ئەورووپاییەکان بەناوی کاری خێرخوازییەوە دەستیان داوەتێ، لە ناخی زەوی ڕۆدەچێنێ و باس لەوە دەکات کە سەرلەبەریان بۆ ئەوە دێنەکردن تا ئەورووپاییەکان وەك کەسانی چاك پیشان بدرێن. ئەو قسانەی فێراری وەك ئەورووپاییەك دەیانکات، هەر بەڕاستی هی ئەوەن گوێیان بۆ شل بکرێ... ئەو قسانەی کە بوونە هۆی مقۆمقۆی ئەوەی "موسوڵمان بووە" ئەمانەن:

"ئیدی ئێمە هیچ شتێکمان لەدەست نایێ لەو کیشوەرە ڕەشەدا. زوو ئەوێ جێ بێڵن! ئیدی قەڵەمڕەویی سپی پێستان بە دوماهی هاتووە. ئێمە، ئێمەی ئەورووپایی، پێشتر بەناوی هەندێك هۆکاری جوان چووینە ئەفریقا. بڕیاربوو پێشکەوتن و مەدەنییەت و پەروەردە و ئاین ببەین بۆ ئەوێ. بەڵێ، مەدەنیەت و گشت ئەمانەمان برد، وەلێ لەگەڵیاندا پۆلیسیشمان برد. پۆلیس ئێستاش هەر لەوێیە... لە ئەفریقا بەردەوام لە ئامادەباشیدایە.

ئەورووپاییەکان، خۆیان بایی خۆیان ئاریشەیان هەیە و لە زیاد بوونیشدایە. ئەوان بە حیساب بۆ چارەسەرکردنی ئەم ئاریشانە دەچن بۆ یارمەتیدانی ڕەشەکان. ئەگەر ڕاستتان دەوێ، نەدەتوانن یارمەتیی ئەوان بدەن و نە دەشتوانن کێشەکانی خۆیان چارەسەر بکەن. ئێمەیەك کە لە مەدەنیەتێکدا دەژین پیر و پەککەوتە و دەستکورتەکان لە پاریس و ڕۆما و لەندەندا مامەڵەی زنجییان

**لەگەڵدا دەکرێ، چۆن دەتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین بەدەم ئەو ئەفریقاییانەوە دەچین؟**

... ئێمە تا ئەو کاتەی کێشەی وزەمان سەری هەڵنەدابوو، ڕەش پێست و عارەبەکانمان سپاردەی خودا کردبوو. کەچی ئێستا وا خەریکین گرنگییان پێدەدەین و بەدەوریاندا دێین وەك ئەوەی بە دەوری سەگ و تەیر و تواڵدا بێین... گرنگی پێدانەکە ڕێك ئاواهییە. ئاردی ماسییان بۆ دەنێرین، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەو خواردنە قوتوویەندانەی بۆ سەگ ئامادە دەکرێن پڕن لە ئاردی ماسی. ئێوە حەتمەن سەرنجی ئەوەتان داوە کە پیسایی سەگ لە خۆرئاوا نەرم و سپی باوە. هەروەها... ناویان لەمە ناوە کاری خێرخوازیی ... کەس نازانێ خێرخوازیی چییە. لێرە لە خۆرئاوا، هیچ کەسێك خێرخواز نییە.

سەیرێکی ئەو کۆنسێرتانەی (ڕۆك)یش بکەن کە بەناوی یارمەتییەوە ساز دەکرێن! ئەرێ بەڕاست، ئەگەر لە بری کۆنسێرتەکانی ڕۆك بیانوتایە فەرموون بۆ کاژێرێك بێدەنگی نواندن، کەس هەبوو ۲۰ دۆلار بدات و بچێتە ژوورەوە؟ کەس نەدەبوو، وا نییە؟ ئەی کەواتە ئەو پارەیە بۆچی دەدەن، بۆ کۆنسێرتی ڕۆك یان یارمەتیدانی ئەفریقاییەکان؟"

فێراری وەڵامی پرسیارێکیش لەمەڕ هێزی داگیرکاریی لای خۆرئاواییەکان دەداتەوە:

"ئەمڕۆش بە هەمان هزری داگیرکاریی مامەڵە دەکریٚ. ئینجا ئەم داگیرکارییە فرە ڕێکخراوتر و فرە مەترسیدارتریشە. لە تەلەفزیۆن بینیم، هەر ڕۆژێکی خودا ٤٠ هەزار منداڵ دەمریٚت. دەبیٚ چۆن بەرپرسیاریٚتیی سیستەمی ئیٚمە لە مەرگی ئەوان بیٚتە شرۆڤەکردن؟ یارمەتی دانی ئەفریقا، وەسیلەیەکە بۆ لەسەر پیٚمانەوەی داگیرکاریی ئیٚمە.

هەماهەنگییە مرۆییەکانی نیٚوان ئیٚمەی خۆرئاوایی، بۆ نزمترین ئاست دابەزیوە. ناکریٚ ئەو ناڕەحەتییەی هەناردەی دەرەوەی دەکەین، ناوی «خیٚرخوازی»ی لیٚبنیٚین. بۆ ئەوەی لە کاتیٚکدا کە دەزانین و دەبینین شارستانیٚتیی ئیٚمە چییە، بیٚین و باس لە خیٚرخوازیی بکەین، دەبیٚ بیٚچاوڕوو بین. فەرموون تاکەکانمان ببینن، چۆن لەسەر شەقامەکاندا لە برسان دەمرن. سەیری بیٚکارەکانمان بکەن، سەیری پیر و پەککەوتەکانی نیٚو خانەکانی بەساڵاچووانمان بکەن... ئینجا، ئیٚمە چی لەو دانەویٚڵە و گۆشت و ڕۆنانە دەکەین کە لە کۆگاکاندا ستۆک دەبن؟ بەشیٚوەیەکی چڕ و هیستریایی بەرهەم دەهیٚنین. دوای ئەوەش هەڵدەسین و ئەوە ڕوون دەکەینەوە پیٚویستە ڕەش پیٚستەکان هەوڵ بدەن و خۆ ماندوو بکەن. با واز لە ئامۆژگاریی کردن بیٚنین. ئیٚمە بۆ ئەو هەموو خواردنانە نانیٚرین بۆ ئەفریقا کە خەریکە ستۆک دەبن؟

لەبەرئەوەی سیاسەت بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە، لەبەرئەوەی ئەم دونیایەمان لەسەر بنەمای «ئەوەی نانی لەدەست بێ، دەسەڵاتیشی لەدەست دەبێ» دەڕواتە ڕێوە. ئەو سیستەمە ئابوورییەی کە هی چاخەکانی ناوەڕاستە، تا ئێستاش هەر بەرگریی لێدەکەین!

ئەوەی کە بەڕاستی پێویستی بە یارمەتیدانە، خۆمانین! "

## مرۆڤی بێکەس و تەنها

ئایا کۆمەڵگە ئەورووپاییەکان بۆ کەوتوونەتە ئەو بارودۆخە مەترسیدارەی فێراری گڵەیی لەدەستییەتی؟ لە بنجی ئەمەدا، کاریگەریی لەدەست دانی بەها ڕۆحی و مەعنەویی و باڵاکان هەیە کە تا ڕاددەیەکی زۆر لەدەست دراون. بەپێی ئەو ئەنجامانەی لەتوێژینەوەیەکیش کە لەسەر سیستەمی پەروەردە و قوتابخانەکانی ئەڵمانیا کراوە، دەرکەوتووە کۆمەڵگە بەخێرایی لە بەها مەعنەوییەکانی دادەبڕێت. لە ئەنجامی ئەمەشدا، شیرازەی خێزان لە شێواندایە و مرۆڤەکانیش سەرەتا بەرەو سەربەخۆیی و دواتریش تەنهایی دەچن. ڕستەیەك کە سەردەمانێك لەسەر دیواری بەرلین دەنووسرا، دواتر بووە ڕستەیەك کە لەسەر جامی ڕاقیترین گەلەرییەکانی وڵات بنووسرێت، ئەو ڕستەیە تەعبیر لەم ڕاستییە تاڵە دەکات: «*Berlin ist allein ich auch!*»، بە واتای «بەرلینیش

وەك من تەنهایە». ئیتر ئەو تابلۆیانەی ئەمەیان لەسەر نووسراوە، لەسەر دیوارەکان دێنە هەڵواسین و لای هەمووانیش بە شتێکی زۆر جوان دادەنرێن. ئەمە درامای حەزینی ئەو کەسانەن کە نەیانتوانیوە ڕۆحی خۆیان تەسلیمی (ڕەحمان) بکەن... هەرچی مرۆڤی باوەڕدارە، چەندێك لەم دڵشکستییە بەدوورە!



لە مامۆستا (عەبدوڵلا یەغین)[1]م پرسیی داخۆ وەزعی لەگەڵ غوربەتدا چۆنە. ئەویش وای وەڵام دامەوە کە زۆر کەم هەست بەو دڵشکستییە دەکات و باسی ئەوەی کرد کە وا بەو جۆرە بیردەکاتەوە: کاتێك «الملك ملك الله و العبد عبد الله» (بەندە بەندەی خودا و موڵکیش موڵکی خودا بێت)، بۆ هەست بە غەریبی بکەم؟

زۆر ڕاستە، لە کاتێکدا کەسێکی موسوڵمان لە غوربەتیشدا هەست بە غەریبی ناکات، ئەوانەی لەم نیعمەتە بێبەشن تەنانەت لە خاك و نیشتمانی خۆشیاندا هەست بە غەریبی دەکەن. چونکە ئەوان دابڕاون لەو سەرچاوەیەی هەقە دڵ و دەروونی پێوە گرێ بدات.

**کەسێك خودای لەبیر نەبێ، چۆن سەرتاپای زەوی بۆی نابێ بە غەریبی؟**

---

١- یەکێکە لە قوتابییەکانی زانای پایەبەرز سەعیدی نوورسی. (وەرگێڕ)



# ڕۆزیی ماددیی - ڕۆزیی مەعنەویی

## مێشك و ڕۆحیش چەشنی گەدە، پێویستیان بە خۆراکە

(مونازەرەیەك)م بیر دێتەوە کە ئەو کاتەی قوتابی بووم لە دوا پۆلی بنەڕەتیدا کردمان. ناونیشانەکەی «ئایا دەبێ بژی بۆ خواردن یان بخۆی بۆ ژیان؟». لە تیروپشکدا، ناوی من لەو گرووپە دەرچوو کە دەبوو داکۆکی بکات لە هزری «ژیان لە پێناوی خواردندا». ئێمە لەبەر ئەوەی هەستمان بە سەختیی داکۆکی کردن دەکرد لە هزرێك کە دەمانزانی هەڵەیە، خۆمان زۆر باش ئامادە کردبوو و خەیلێك قسەی بەباقوبریقمان کرد. لە کۆتادا گرووپەکەی ئێمە بردییەوە. ئەمەش مامۆستای ئەدەبیاتی ناچار کردین، بەدووردرێژی

ڕوونکردنەوە بدات لەسەر ئەوەی کە "ئەمە تەنها بۆ مونازەرە ڕاستە، ئەگەر نا هەر کەسێك ئەقڵ لە مێشکیدا بێ، نابێ لە پێناوی خواردندا بژی".

ئێستا بپردەکەمەوە، ئێمە بێئەوەی ئاگامان لێ بێ کەوتبووینە داکۆکی کردن لەو شتەی زۆرینەی خەڵکی بەشوێنییەوە بوون، کە ئەگەر باوەڕیشیان پێ نەبووبێ خۆ بە کردەوە کردوویانە... ئەوەی دەیبینین ئەوەیە کە زۆرینەی خەڵکی هان بەدوای ڕۆزیدا. بەجۆرێکیش کە کەوتوونەتە ژێر فەرمان و خزمەتکاریی ڕۆزیی. چی گیاندارە، بووە بە بەندە و بەندیی ڕزق. بۆ بەدەست هێنانی، خۆیان تووشی چی ناکەن؟! ئەو شتەی کە ئادەمزاد لە هەموو شتێك زیاتر عاشق و عەودالییەتی، ڕزق و ڕۆزییە. بە گوزارشتێکی دی، ئەو خاڵە هاوبەشەی کە ئادەمزاد و ئاژەلان بە ویست و حەزێکی زۆرەوە ڕوویان لێیەتی، ڕۆزییە... ئینجا ئەوەی ئادەمزاد ئاوا بەخوێنگەرمییەوە ڕووی لێناوە، تەنها پەیوەندیی بە گەدەوە هەیە. واتە مرۆڤ ڕووەو ئاژەڵ بوون دەچێ. کاتێك ڕۆزیی کە شتێکە تەنها پەیوەندیی بە جەستە و ماددەوە هەیە دەکرێتە ئامانجی سەرەکی و تاکە ئامانج، مرۆڤ سیفەتە مرۆییەکانی لەدەست دەدات و دەبێت بە فیرعەون.

# چۆن ڕۆزیی دەبێت بە ڕۆحانیی؟

بەو پێیەی مرۆڤ بوونێکی ئاژەڵی نییە کە تەنها لە ماددە پێکهاتبێ، بۆیە پێویستە ئەو ڕۆزییەی دەبێتە هۆی ئەوەی ژیانی درێژە بکێشێ، بە بەرز و مەعنەویی بکرێ و تەنانەت بکرێت بە شتێکی ڕۆحانیش. ئیسلام چارەسەری ئەمەی بە جوانترین شێوە کە لە مرۆڤ بوەشێتەوە، پیشان داوە.

مرۆڤ بە سێ ڕێگە دەتوانێ ئەو ڕۆزییەی نسیبی بووە، لە ماددی و ئاژەڵی بوون دەربێنێ:

١- بەوەی وا لێی بڕوانێ کە هی خودایە

٢- شوکرانەبژێری

٣- خواردنی بەحەڵاڵی...

ئێستا با بێینە سەر ئەمانە:

١- ئەگەر لە ڕوانگەی باوەڕەوە بڕوانین، دەتوانین بڵێین کە چی لە سروشتدا هەیە پیت و وشە و ڕستەگەلێکن. لەنێو ئەو پیتانەی کتێبی گەردوونیان پێنووسراوەتەوە، ڕۆزیش هەیە. وەك چۆن پیتەکان لە خۆیان زیاتر، ئاماژە بەو کەسە دەدەن کە نووسیونییەتیەوە، ڕۆزییەکانیش ئاوا ئاماژە بەو بەدیهێنەرە دەدەن کە ئەوانی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون و بەنسیبی مرۆڤی کردوون. مرۆڤ بە چاوی باوەڕدارانەوە بڕوانێ، مانای ئەو پیت و وشە و ڕستانەی ڕۆزیی

دەخوێنێتەوە و لەو هێمایانەیان دەگات کە بۆ خودای دەکەن، بەڵام بە تێڕوانینێکی بێباوەڕانەوە، لەوە دەردەچن ببن بە پیت و هێما بۆ یەکێك بکەن، بەڵکو وایان لێدێ تەنها خۆیان پیشان بدەن و لەوە بەولاوە هیچ مانا و مەدلولێك لەخۆ نەگرن... ئەمە لە کاتێکدا کە هەموو بوونەوەرێك، زۆر لە خۆی زیاتر گوزارشت لە بەدیهێنەرەکەی دەکات و نمایانی دەکات.

٢- شوکرانەش سەرەنجامی ڕۆزییە. ڕۆزیی بە شێوە ڕازاوەکەی و تام و بۆنە خۆشەکەی، بانگهێشتی شوکرانەبژێریی دەکات. یەکەم کارێك کە ئەو مرۆڤەی پەی بەم هونەرە باڵایانەی نێو ڕۆزیی دەبات، شوکرانەیە... بەم جۆرە ڕۆزیی شوکر و، شوکریش ڕەزای خودای ڕەحمان دەستی مرۆڤ دەخات.

کەسێك بزانێت ئەو نیعمەتەی دەیخوات، دیارییەکە لە گەنجینەی ئەو کردگارە مەزنەی زانست و توانستی بێ کۆتایە، ئەو تامەی زمانی وەریدەگرێت هەزار قات زیاد دەکات. نیعمەتەکە دەبێ بە نوورێك، تەنها گەدەی تێر و پڕ ناکات، بەڵکو دەبێت بە تام و خۆراك بۆ ڕۆح و دەروونیشی. شوکرانەبژێریی بەهۆی ئەو خێر و پاداشتەی دەستی مرۆڤی دەخات، ئەو خواردن و خواردنەوەیەی دەخورێت، دەیکات بە میوەجاتی بەهەشت. بەم جۆرە لە سایەی شوکرانەدا ڕۆزییە فانییەکانی دونیا دەبن بە تام و میوەی ئەبەدیی.

به ناشكوريش، تامه كاتييه‌كان دێن و پاشانیش ده‌ڕۆن، له دوای خۆشیاندا ژان و حه‌سره‌ت جێ ده‌هێڵن. ئه‌وه‌ی له ڕۆزییه شوكر له‌سه‌ر نه‌كراوه‌كان جێ ده‌مێنێ، ته‌نێ پاشه‌ڕۆیه. ئه‌و لایه‌نه‌ی ڕۆزیی كه هی پێ عاشق بوونه، ئه‌و لایه‌نه مه‌عنه‌وییه‌یه‌تی كه شوكرانه به‌ده‌ست ده‌خات. عه‌شقی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه پە‌ی به‌م مانایه نابه‌ن بۆ ڕۆزیی، جیاوازییه‌كی نییه له‌گه‌ڵ چێژ وه‌رگرتنی ئاژه‌ڵان.

هه‌ر كاتێك ڕۆزیی ببێته پیتێك، هێما بۆ كردگار بكات و شوكرانه‌ش به‌دوای خۆیدا بێنێ، ئه‌وه له‌گه‌ڵ خۆیدا قه‌ناعه‌ت و ئیقتیسادیش دێنێت. كه‌سێك شوكرانه نه‌كات، ناتوانێ خۆی ڕزگار بكات له‌وه‌ی ببێته یاریچه‌ی ده‌ستی ئیسراف و حه‌رام.

٣- ئیسلام ئامۆژگاریی ئه‌وه ده‌دات كه ته‌نانه‌ت خواردنی ڕۆزیی حه‌ڵاڵیش بۆ نزمترین ئاست دابه‌زێنرێت. ته‌نانه‌ت ئامۆژگاریی هاوبه‌شی گشت پێغه‌مه‌ر و ئه‌ولیاكان "كه‌م بخۆ، كه‌م بڵێ، كه‌م بخه‌وه"یه.

**ئایا له بیروباوه‌ڕێكدا كه ئامۆژگاریی ئه‌وه بدرێت ته‌نانه‌ت حه‌ڵاڵیش به‌پێوانه به‌كار بهێنرێت، دۆزینه‌وه‌ی ڕێ و شوێن بۆ حه‌رام مومكینه؟**

به گوزارشتی (یوونس ئه‌مره) یه‌كێك:

**چی هاته ده‌ست، شۆڕی كاته‌وه**

**چی هاته ده‌م، نه‌یگێڕێته‌وه**

پشکی لە باوەڕدا کەمە. هەر بۆیە دوعای ئەو کەسانەی گەدەی پڕ لە گوناهیان هەڵگرتووە، گیرا نابێت.

(مەلا گورانی) بەردەوام ئەم ئامۆژگارییەی (سوڵتان محەمەد فاتیح)ی قوتابیی دەکرد:

**"خۆت لە حەرام بپارێزە، خۆت لە لوقمەی حەرام بدزەوە".**

ڕۆژێکیان کە هەردووکیان پێکەوە و لە هەمان قاپدا نانیان دەخوارد، فاتیح دەیەوێ تەشقەڵەیەك بە مامۆستاکەی بکات و دەڵێ:

"ئێ دە ئەوە تۆش لە ڕزقەکەی من بوویت بە هاوبەش. ئەگەر ڕزقی من حەرامی تێکەوتبێت، ئەوا جەنابیشتان حەرامتان خواردووە".

مەلا گورانییش ئەم وەڵامەی دەداتەوە:

**"ئەگەر واش بێت، ئەوا ئەوەی کەوتووەتە بەردەمی من لوقمەی حەڵاڵە".**



سوڵتان دوای ماوەیەك قاپەکە دەسووڕێنێت و بەردەوام دەبێت لە گاڵتەکەی... کە مەلا گورانییش هیچ خۆی تێکنادات و لە خواردنەکەی بەردەوام دەبێت، فاتیح دەڵێت:

"ئیدی گومان لەوە نەما کە حەرامت خوارد!"

بەڵام وەڵامەکەی مەلا گورانی بەڕاستی نموونەیەکی واقیعیی وەڵامی ئامادەیە:

"نەخێر، حەرام ناخۆم... لەبەر ئەوەی لەبەردەم خۆت حەرام و لەبەردەم منیشدا حەڵاڵ نەما، بۆیە قاپەکەت سووڕاند..."

ئەم تێگەیشتنە کە بەگاڵتەش بێ خۆی لە قەرەی لوقمەی حەرام نادات، بەهۆی ئەو شعوورەوە هاتووەتە ئاراوە کە ئیسلام دروستی کردووە.

***



## خۆراکی مێشکمان

**تۆ بڵێی خۆراکەکانی گەدەی مێشکەکان لە چیدا بن؟**

زانیارییەکانی نێو مێشك، چەندەیان باش و بەسوودن؟ وەك چۆن لەو لوقمە حەرامانەی قوت دەدرێن دەپرسرێتەوە، ئاواش ئەو قسە حەرامانەی دەکرێن، هەر لێپرسینەوەیان لەسەرە. کەسێك ٧٥ ساڵ بژی، بەتێکڕا ٩٠ ملیۆن وشە دێتە گۆ. ئایا لە سەدا چەندی ئەو ٩٠ ملیۆن وشەیە لەوانەن کە دەتوانرێ حسێبی بدرێ؟ قسەش کە یەکێکە لە دەرخەرەکانی ئەوەی گەدەی مێشك هەرسی کردووە، دەبێ لە حەڵاڵەکان بێت...

## خۆراکی ڕۆح

**ڕۆحەکان، دەبێ لە چ ڕێزییەکدا بەدوای خۆراکیدا بگەڕێت؟**

ئەرێ ئەبێ مرۆڤ جەستەی بەخێو و گەورە بکا و، لەولاشەوە هەر خاوەنی ڕۆحی لەڕ و کورتەبنە بێت؟ هەندێك جار شەیتان وا لە مرۆڤ دەکات ئەو خۆراکەی هی نەفسە، بە هی ڕۆحی بزانێ. بۆ نموونە تەنانەت هەندێ جار دەتوانێ وا لە مرۆڤ بکات کە ئەو ستایلە مۆسیقیانەی هی نەفس و سەفاهەت و بگرە بەدکارین، بە خۆراکی ڕۆحیان دابنێ. ئەوە لە کاتێکدا، کە ئەوەی ئەو ئارەزووانەی بەو جۆرە خۆراکانە دێنە گۆش کردن چی دەکەن، لەبەر چاوانە. ئەو مۆسیقایەی کە هیچ هەستێکی بالا پەرە پێنادات، بەڵکو ڕێك بەپێچەوانەوە دنەی لایەنە ئاژەڵییەکانی مرۆڤ دەدات و زۆربەی جار وەك هەنگوینێکی ژەهراوی وایە.

## ڕۆحی مردووانیش پێویستی بە خۆراکە

**ئەی بۆ ڕۆحی مردووان، دەبێ چ خۆراکێکیان پێشکەش بکەین؟**

ئەگەر شتێکی وامان بەڕاستی بەلاوە گرنگ بێت، دەبێ بەچاکی بیر لەوە بکەینەوە داخۆ تاجە گوڵینەکان تا چەند سوودیان هەیە یان نییانە.

چینییەکان لە کاتی ناشتنی مردوواندا، قاپێك پڵاوی برنج کە زۆریان مەراقە، دەخەنە ناو گۆڕەکانیانەوە... گەشتیارێکی ئەورووپایی مەڕاسیمێکی وا دەبینێ، دەپرسێت:

– کەی ئەم مردووە هەڵدەستێتەوە و ئەو برنجە دەخوات؟..

چینییەکیش بێ ئەوەی هیچ خۆی تێکبدات، وەڵامی دەداتەوە:

– ئەو کاتەی مردووەکان بۆنی ئەو چەپکە گوڵانە دەکەن کە ئێوەگەل دەیخەنە سەر گۆڕی مردووانتان!

جا بۆیە دەبێ بۆ ڕۆحی مردووان دیاریی مەعنەویی بنێررێ، هەر وەك چۆن موسوڵمانە خاوەن هەستەکان وا دەکەن...

***

موسوڵمانێك بە ناو حەوشەی مزگەوتێکدا تێدەپەڕیی. کوڕە شەش ساڵانەکەی کە لەگەڵیدا بوو، لێی پرسی:

– بابە گیان! ئەو قەرەباڵغییە چییە؟

– کوڕی خۆم! ئەها سەیری ئەو تەرمە بکە لەو بانە... کەسێك مردووە... ئیتر ئەو خەڵکە وەستاون، دوعای لەسەر دەخوێنن... ئێستا کەمێکی تر نوێژی مردووی لەسەر دەکرێ...

باوکەکە هەستی کرد منداڵەکەی مەراق گرتوویەتی، کەمێکی تر زانیاریی دایێ، ئینجا لێی پرسی:

– کوڕە ژیرەکەم! کە منیش دەمرم، تۆ ئاوا لەسەرم دەخوێنیت، وا نییە؟



منداڵەکەش وتی:

– ئەی چۆن، باوکە گیان!..

– چیم لەسەر دەخوێنی؟ بۆ نموونە...

– وەڵڵا هەر چییەکم دەست بکەوێ، کتێب، گۆڤار، ڕۆژنامە... بەس تۆ داوا بکە، ئیتر هەقت نەبێ...

باوکەکە نەیتوانی لەو کوڕەی تووڕە ببێ کە تا ئەو تەمەنە وای دەزانی هەر ئەوانەی ژماردنی، هی خوێندنن... یەکسەر بڕیاری دا سیپارەیەکی بۆ بکڕێ و، ئەوەندەی خۆی دەیزانی یەکەم دەرسی قورئانی بە منداڵەکەی دایەوە...

بەڵێ، هەڵبژاردنی ڕێزیی و خۆراکی گەدە و مێشك و ڕۆح لەو شتانەی حەلاڵن، دەبێتە گەورەترین هۆکاری بەختەوەریی موسوڵمانانی ئەمڕۆ. خودای گەورە، ئەمە بەنسیبی هەموان بکات.



# پێڕست